# گەنجە کوردەکان

## یەکەمین پڕۆژەی مەعریفیی کورد لە مێژوودا

**کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم**

**فەرهاد پیرباڵ**

ناوی نووسەر: فەرهاد پیرباڵ
ناوی کتێب: گەنجە کوردەکان یەکەمین پڕۆژەی مەعریفیی کورد لە مێژوودا
تایپ و نەخشەسازی: ماڵی شەرەفخانی بەتلیسی لە هەولێر
تیراژ: ٢٠٠٠
ژمارەی سپاردن:
سلێمانی: ٢٠٠٧
بڵاوکراوەکانی: مەکتەبی بیر و هوشیاری (ی.ن.ک.)



ئەم دەستە کە چوو دەستەیەکی تازەیە دێ
مەعلووم نەبوو ئەم کەشمەکەشە کەی دەبڕێ

**حاجی کۆیی**

هەڵستاون جەوانانی وەتەن دیسان بەبێ باکی
لە حەسرەت دەوری کۆنە موڵکی بابیان هاتنە چالاکی
دە دڵ عەزم و لەسەر شۆڕی جەوانی، هاتوون دەخوازن
کە بڕژێنن لەسەر خاکی وەتەن خوێنیان بەسەرپاکی
لە غوربەت لاوی کوردان بۆ نیگای وەسڵی تۆ مەحزوون
شەو و ڕۆژ ناسرەون بۆ شەهدی شیرین ژەهرە تریاکی

مستەفا شەوقی قازی زادە
یەکێک لە شاعیرە **گەنجە کوردەکان** (١٩١٩)

ئەم نامیلکەیە هەوڵدانێکە بۆ دەسنیشانکردنی ڕیشە ئەپستمۆلۆژی و پەلوپۆ مەعریفییەکانی ئەو نەوە گەنجە ڕاچەنیوە کوردەی کە هاوهەنگاوی «گەنجە تورکەکان»، لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و لە سەرەتای بیستەمدا، لەژێر کاریگەریتیی کولتووری ئەورووپیدا لەدایک بوو و.. فەرهەنگی کوردی تازە کردەوە.

## پێشینەیەکی مێژوویی لەبارەی «گەنجە تورکەکان»

---

عوسمانییەکان سەبارەت بەوەی پایتەختی ئیمپراتۆریەتەکەیان لە ئەورووپا نزیک بوو، پەیوەندییەکی بازرگانی و سیاسی و ڕۆشنبیریی پتەویان – هەر لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمەوە – لەگەڵ ئەورووپا هەبوو. بۆیەش، تورک، لە زۆر زووەوە (پێش کورد و عەرەب و فارس) توانیویانە پەیوەندی لەگەڵ ژیانی کولتووری و سیاسیی ئەورووپا دروست بکەن.

ساڵانی (١٨٣٩ ـ ١٨٧٦) لە مێژووی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بە قۆناغی «تەنزیمات» ناودەبرێت کە بریتی بوو لە هەوڵدان بۆ ریفۆرم لەناو دەوڵەتدا و نەخشە دانانێکی چاکسازیی فراوان لە ئاستی کولتوور و ژیانی دارایی میللەت و بەڕێوەبردنی وڵات. ئەمەش تا ساڵی ١٨٧٦ درێژەی کێشا، واتە تا ئەوکاتەی مەدحەت پاشا جڵەوی حکوومەتێکی دەستووریی گرتە دەست.



لەو زەمانەدا هەر چی بزووتنەوەیەکی ئایدیۆلۆژی و کولتووری لە ئەورووپا دروست ببووایە، یەکسەر لە تورکیا دەنگی دەدایەوە و سوودی لێ وەردەگیرا. ئەم قۆناغەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بە قۆناغی بووژانەوەی سیاسی و کولتووری و شارستانی لە قەڵەم دەدرێ لە ژیانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا.

لەو قۆناغەدا چەند نووسەر و رووناکبیرێکی عوسمانی (تورک و کورد و عەرەب و چەرکەس..) کە ماوەیەکی زۆری ژیانیان لە ئەورووپا و بەتایبەتیش لە فەرەنسا بەسەر بردبوو، بە نووسین و وەرگێڕان و کار، تەکانێکی گەورەیان دایە ڕۆشنبیری و داهێنان و پەرەسەندنی بیر و زانست؛ لەوانە، بۆ نموونە: د. عەبدوڵا جەودەت، ئیسحاق سکووتی، ڕەزا گۆگالب دیاربەکری، ئیبراهیم شیناسی (١٨٢٦ ـ ١٨٧١)، نامیق کەمال (١٨٤٠ ـ ١٨٨٨)، عەلی بەگ (١٨٤٤ ـ ١٨٩٩)، ئەحمەد مەدحەت ئەفەندی (١٨٤٤ ـ ١٩١٢)، شەمسەددین سامی (١٨٥٠ ـ ١٩٠٧)، مەحموود ئەکرەم ڕەجایی زادە (١٨٤٧ ـ ١٩١٣)، محەمەد ڕەفعەت (١٨٥١ ـ ١٩٠٧)، ئەبو زیا تۆفیق (١٨٤٩ ـ ١٩١٣)، تۆفیق فیکرەت (١٨٦٧- ١٩١٥)، جەناب شەهابەدین (١٨٧٠- ١٩٣٤)، عبدالحق حامد (١٨٥٢- ١٩٣٧).. دەیانی تریش.

ئەمانە، لە ڕێگای داهێنانەوە، هەروەها لە ڕێگای وەرگێڕانی بەرهەمەکانی ڕۆژئاواوە، گۆڕێکی تازە و ناوەڕۆکێکی مۆدێرنییان بەخشییە بزاڤی رووناکبیری و ئەدەبیات.

لەو سەردەمەی تەنزیماتدا، یەکەمین کۆمەڵە و ڕێکخراوە پیشەییە ئازادیخواز و ریفۆرمیستەکان، یەکەمین قوتابخانە و تیپی شانۆیی و یانە و چاپخانە و پەیمانگە و زانکۆ و ڕۆژنامە و گۆڤار و شانۆنامە، هەروەها یەکەمین بیرمەندە ڕۆشنگەرە عوسمانییەکان سەرهەڵدەدەن و ناو لە خۆیان دەنێن عوسمانییە نوێیەکان «یێنی ئۆسمانیلار»، کە پاشتر ئەم بزاڤە ڕەهەندێکی سیاسی وەردەگرێت و لەژێر ناوی «تورکە گەنجەکان» دەناسرێتەوە. «١»

زاراوەی «گەنجە تورکەکان» بە عەرەبی ترکیا الفتاە، بە فەرەنسیش Jeunes Turcs ، بەم شێوەیەی خوارە وە پەیدا بووە:

لە شوباتی ١٨٦٧، ڕۆژنامەیەکی بەلژیکی بە ناوی(لۆ نۆرد) خەبەری ئەوەی بڵاوکردەوە کە میری تورک، مستەفا فازیل، دامەزراوێکی بانقیی لە تورکیا دامەزراندووە. ئەم میرە تورکە لە نامەیەکیدا لایەنگرانی خۆی شاباش کردووە لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی (تورکیای گەنج Jeune Turquie )دا.

ئەو، ئەم زاراوەیەی، بێگومان، لە زاراوەی (ئیتاڵیای گەنج) و (فەرەنسای گەنج) و (ئەڵمانیای گەنج) وەرگرتبوو، کە پێشتر لای ئەورووپییەکان بەکارهاتبوو. زاراوەی (تورکیای گەنج) دووای ئەوە، یەکسەر لەلایەن ڕۆژنامەی Courier d Orient سەرلەنوێ بەکارهاتەوە، چونکە سەرنووسەرەکەی، دۆستی ڕووناکبیرە ئازادیخوازە عوسمانییەکان بوو. ئنجا هەمان زاراوە لەلایەن ڕۆژنامەی عوسمانیی (مخبر)ەوە، لە



تورکیا، لە ١٨٦٧/٢/٢١ بەکارهاتەوە. لە کۆتاییشدا، لەلایەن عەلی سوواڤی و نامیق کەمال، لەجیاتی زاراوەی (عوسمانییە تازەکان «یێنی ئۆسمانیلار») کەوتە بەکارهاتن. بەم شێوەیە، پەیتا پەیتا بڵاوکراوەکانیان لەژێر ئەم ناوەدا، یان لەژێر ناوە فەرەنسییەکەی ( ژۆن تورک Jeunes Turcs) واتە «گەنجە تورکەکان» بڵاوبوونەوە.«٢».

## زاراوەی «گەنجە کوردەکان» چ پەیوەندییەکی بە «گەنجە تورکەکان»ەوە هەیە؟

ناونانی ئەو وەچە ئازادیخواز و ریفۆرمیستەی کورد بە «گەنجە کوردەکان» لاساییکردنەوەی زاراوەی «گەنجە تورکەکان» نیە؛ بەڵکو ئەوە دەسەلمێنێ کە نەتەوەی کوردیش وەک ئەڵمان و فەرەنسی و تورک و ئیتاڵییەکان، لەو سەردەمەدا لەناو ژانی نوێبوونەوەیەکی کولتووریدا ژیاوە، ویستوویەتی پرۆژەیەکی ئەپستمۆلۆژیی هەبێت و ڕێنسانسێکی کولتووری بەرپا بکات.. تەنانەت خودی ئەم گەنجە کوردانە چەند توخمێکی بنەڕەتی بوون بۆ خوڵقاندنی بزاڤی «گەنجە تورکەکان» و بناغەیەک بوون بۆ ئەو پرۆژە مەعریفییە مەزنەی کە سەرتاپای داروپەردووی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی هەڵوەشاندەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەمەش با بپرسین: بە کام بەڵگە و ماف دەتوانین ناو لەم نەوە نووسەرە نوێخوازە کوردەی سەرەتای سەدەی بیستەم بنێین «گەنجە کوردەکان»؟

د. عەبدالله جەودەت، کە ڕووناکبیرێکی کوردە و خۆی دامەزرێنی بزاڤی گەنجە تورکەکانە و ڕۆڵی هەیە لە بەرەو پێشەوبردنی بزاڤی ڕۆشنبیرانەی گەنجە کوردەکانیش (دائیرەتولمەعاریفی ئیسلامی لە چاپە فەرەنسیەکەی بە هەشت لاپەڕە باسی ڕۆڵ و چالاکییەکانی دەکا)؛ یەکەمین کەسێکە کە لەسەر وەزنی (گەنجە تورکەکان)، لە وتاری «بیر خطاب» لە ژمارە (١)ی گۆڤاری (ڕۆژی کورد) لە ئەستەمبوڵ، ساڵی ١٩١٣، ناو لەم نەوە کوردە دەنێ (گەنجە کوردەکان)؛ دەڵێ: **ئەمەش چونکە ئەم نەسلە تازەیە بووە پردێک لەنێوان ئەورووپا و کوردستان: کولتووری دنیای ڕۆژئاوای بە تورکیاشەوە بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا گەیاندە کوردستان.**

پاشان، ئەم زاراوەیە، دیارە بەتەواوەتی لە ناوەندە ڕووناکبیرییەکانی ئەوکاتەدا بڵاوبووە. بەڵگەمان ئەوەیە کە حاجی مووسای سەرۆک عەشیرەتی کۆرچیخان، یارمەتیدەری ڕێکخراوی هێڤی، گوتوویەتی: «ئەگەر گەنجە کوردەکان کوورەیەک دروست بکەن، ئێمە ئامادەین ببین بە دار و خۆمان لەو کوورەیەدا بسووتێنین» «٣». ئەم قسەیەی حاجی مووسا ئەوەش دەگەیەنێ کە ئەم ڕووناکبیرە گەنجە کوردانە، لە بەستێنی سیاسەتیشدا کاریان کردووە، جگە لەوەی کە باوەڕپێکراوی خەڵک و عەشیرەتەکانیش بوونە.

لە بەستێنی ئەکادیمیشدا، کوردناسی رووس، ڤ. ئە. گەردلیڤسکی، بە هەمان شێوە، زاراوەی (گەنجە کوردەکان)ی بەرامبەر (گەنجە تورکەکان) بەکارهێناوە. «٤»





## فاکتەر و هۆکارەکانی دروستبوونی بزاڤی «گەنجە کوردەکان»

«گەنجە کوردەکان» ئەو نووسەر و سیاسەتمەدار و ڕووناکبیرە گەنجە کوردانەن کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، لەڕێگەی پرۆژەیەکی مەعریفی و کاری ڕێکخراوەییەوە، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی نەتەوەییماندا یەکەمین هەنگاویان هەڵنا بەرەو بە مەدەنی کردنی کۆمەڵگەی کوردەواری، وەک د. عبدالله جەودەت دەڵێ: یەکەمین ئەو پردانەیان دروستکرد کە دەمانگەیەنن بە ئاقارەکانی ئازادی و ریفۆرم و تازەبوونەوە. ڕاستییەکەیشی، ئەگەر باس لە مێژووی مۆدێرنیزم بکرێت لە چوارچێوەی کولتووری کوردستانیدا، ئەم بزاڤە باس لێ نەکراوەی گەنجە کوردەکان بە یەکەمین دەروازەکانی نوێبوونە و مۆدێرنیتەی کورد دەژمێردرێت.

ئەو گەنجە ڕووناکبیرانە، لەژێر کاریگەرێتی چەند فاکتەرێکی جۆراوجۆردا، بەری داری بارودۆخێکی شارستانیی تازە بوون. ڕاستییەکەیشی، خودی خۆشیان لە هەمان کاتدا خوڵقێنی ئەو بارودۆخ و هۆکارانە بوون بەسەر یەکتر. کاریگەرێتییەکانیان وەردەگرت و لە هەمان کاتیشدا دەیانبەخشینەوە.

کەواتە فاکتەرەکانی دروستبوونی ئەم بزاڤە، خودی بیرکردنەوەی یاخیگەرانەی ئەو گەنجانە بوو لەهەمبەر دۆخە سواوەکە. بۆیە دەتوانین دەسنیشانی پەیوەندییەکانی نێوان ئەوان و بارودۆخ - فاکتەرەکان، بەم شێوەیەی خوارەوە بکەین:



لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩مەوە تا سەرەتای بیستەم، هەستی ناسیوونالیستی و ڕاپەڕینە چەکداری و نیشتیمانییەکان بڵاچەیان سەندبوو: میرنشینی سۆران (١٧٨٤- ئابی ١٨٣٦)، میرنشینی بابان (١٨٥١)، میرنشینی بادینان (١٨٣٧)، میرنشینی بەدرخان (١٨٤٧ - کە لە ١٨٤٢ ئاڵا و دراوی خۆیشی دامەزراندبوو)، هەروەها ڕاپەڕینەکانی یەزدان شێر (٥٣- ١٨٥٥)، ڕاپەڕینەکانی شێخ عبیداللەی نەهری (١٨٧٨- ١٨٨٢)، ڕاپەڕینەکانی شێخ عەبدولسلامی بارزانی (١٩٠٧- ١٩١٤)، ڕاپەڕینەکانی سمکۆ ئاغای شکاک (١٩١٣)، ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحموود (١٩١٨-١٩٢٣)، هەروەها ئەوانی دەرسیم لە سەرەتای ساڵانی (١٩٢٠)، ئنجا ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیدی پیران لە ١٩٢٥، تا دەگاتە ساڵی ١٩١٩: داخوازینامە نێودەوڵەتیەکەی ژەنەراڵ شەریف پاشا لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی... هەموو ئەم ڕاپەڕینە ناسوونالیستانە زەمینەیان خۆشکرد بۆئەوەی نەوەی نوێی گەنجی کورد (نووسەر، سیاسەتمەدار، شاعیر، ڕۆژنامەنووس، ڕووناکبیران و قوتابیانی زانکۆکان..) بەشێوەیەکی تازە و جیاواز بیر بکەنەوە، بە ئاوایەکی مۆدێرن و نەتەوەخواز خەبات بکەن.. کە گەلێک جاران ئەم خەباتە بەشێوەیەکی بەرنامەڕێژیش دەرکەوتووە.

کەواتە، بەپێچەوانەی دۆخی ڕۆژئاوا و بەپێچەوانەی زۆربەی نەتەوەکانی دراوسێمان؛ بناغەی ئەو پرۆژە مەعریفییەی گەنجی کورد لە بەستێنی مۆدێرنیزم و نوێکردنەوەدا، لای «گەنجە

کوردەکان» بریتی بووە لە پڕۆژەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی و ئازادیخوازیی نیشتیمانی، کە لە کۆتاییدا ڕاپێچاون بەرەو چەمکەکانی دیکەی وەک: دادپەروەری، ریفۆرم، مافی ئافرەت، ئازادیی ڕادەربڕین، دیموکراسی، مەدەنیەت.. هتد. لەسەرەتادا پڕۆژەیەکی ئازادیخوازی نەتەوەیی هەبووە ئنجا پاشان ئەو پڕۆژەیە خۆی لە چەمکە کۆمەڵایەتی و شارستانی و مرۆڤایەتی و کولتوورییەکان ئاڵاندووە. لێرەدا تەنێ چەند دێڕێکی شاعیران بە نموونە دەهێنینەوە:

دە هەڵسن تاکو ئێمەش دەوڵەتێکی کوردی تەشکیل کەین
وەکو قەومی یەهوود و سرب و بولگار، ئەرمەن و یۆنان

فایەقی تاپۆ

هەر ئەڵێم باسی سیاسەت ناکەم و لێی دوور ئەبم
عاقیبەت ئەمخاتە نووسین زوڵمەکانی تورکیا

زێوەر

لانەواز و بێکەس و مەزلوومن ئێستە قەومی کورد
گا بەدەستی تورکەکان و گا بەدەستی ئێرانەوە
حاڵی کورد ئێستە لە بەینی تورک و ئێران و عەرەب
بێچووە تەیرێکە کە کەوتە داوی منداڵانەوە
ئەمرۆ با وابێ بەڵام ڕۆژێ ئەبێ ئەولادی کورد
دێنەوە مەیدان بە عیلم و سەنعەت و عیرفانەوە
نەوجەوانانی وەتەن تەوحید ئەکەن ئەم میللەتە
هەر لە کرماشان هەتا ورمێ و سنە و بۆکانەوە

ئەحمەد موختار بەگی جاف



فاکتەرێکی دیکەی بێداربوونەوەی گەنجی کورد، بێگومان بریتی بووە لە زوڵمی ناوخۆی دەسەڵاتی کورد (بەتایبەتی زوڵمی ئاغا و مەلا و میری کورد بەرامبەر بەو خەڵکە ڕەشوڕووتەی کوردستان) بە هەنجەتی دین و بە پاساوی گەورە و بچووکییەوە.

ئەم زوڵمە ناوخۆییەی دەسەڵاتی کوردی بەئاشکرا لەناو ئەدەبیاتی ئەو گەنجە کوردە ڕاچەنیوانە ڕەنگی داوەتەوە. عەلی کەمال باپیراغا لە ژ (١٨)ی (ژیانەوە)دا نووسیویەتی:

ئەوساکە وەسائیت لە عیراقا هەمووی کەر بوو
لۆکس نەبوو ناویشی قتووی نەوت و فەنەر بوو
ئەم خەلقە  هەموو دەربەدەر و خەستە جگەر بوو
بێ مەعریفەت و سنعەت و بێ عیلم و هونەر بوو

حاجی قادری کۆیی، کە گەنجێکی ڕاچەنیوی سەر بەو نەوە بێدارە ڕاپەڕیوەیە، لە ئەستەمبوڵەوە یاخیگەرانە لەدەست ئەم دواکەوتنەی میللەتەکەی خۆی هاوار دەکات:

هەر کوردە لە بەینی کوللی میللەت
بێ بەهرە لە خوێندن و کیتابەت
یەکسەر عولەما درشت و وردی
ناخوێننەوە دوو حەرفی کوردی
ئوستادی خەتن لە ئەم سیانە
وەک دی لە زوبانی خۆیدا نەزانە

یان دەڵێ:

هەر شێخێ کەوتە شوێنی یەک دوو کەسی ڕەش و ڕووت
خەڵکی بە موور دەزانێ خۆی حەزرەتی سلێمان

بە هەمان شێوە بێکەسی شاعیر، هۆکاری دواکەوتنی کورد دەگەڕێنێتەوە بۆ دەسەڵاتی ئەوانەی کە دین بۆ چەوساندنەوەی مرۆڤی کورد بەکاردێنن، دەڵێ:

لای مەلا وایە کە جەننەت تەکیە و لاتخانەیە
جێی مورید و شێخ و صۆفی مەلجەئی دێوانەیە
شێخ ئەگەر سەد کەس بە خەنجەر لەت بکا بەئسی نیە
گان بکا تاڵان بکا کوشتار بکا ترسی نیە
چونکە ئەولادی ڕەسووڵە قەتعییەن پرسی نیە
خائین و بێ دین لەکن ئەو عاشقی پەیمانەیە
مامە صۆفی وای تەمایە هەر بە ڕیشی پانەوە
قەسری بۆ حازر کرابێ پڕ بە حۆریی جوانەوە
ئەو ئەڵێ جەننەت بە ڕیشە چی بەسەر عیرفانەوە
سەد سەلاحەدین و دارا قیمەتی یەک ئانەیە
گەر بەهەشت هەر ببێتە جێگەی جاهیل و شێت و کەران
دۆزەخیش مەخسووسی پیاوی فازیڵ و ساحێب نیشان
خوایە بمخەیتە جەهەننەم نەچمە ڕیزی وەحشییان

مەلا و میر و موفتی و ئاغای کورد بەدرێژایی سەدەکانی ڕابردوو ئەسڵەن گەنجێتییان لە کۆمەڵی خۆیاندا سەربڕیبوو؛ وایان کردبوو تا هەتایە تەنیا عەقڵی پیر و زەوقی پیر و ئەخلاقی پیر دەسەڵاتدار بێت، وەک حاجی کۆیی دەڵێ:



صەد شێخ و مەلا و ئەمیر و خانی
بۆ لەززەتی عەیش و زیندەگانی
لەولاوە ئەوان بە حیلەسازی
لەملاوە ئەمان بە تەقلەبازی
قوڕیان بە هەموو وڵاتەوە دا
تا موڵک و ڕەعیە پاکی فەوتا

ئەم زوڵم و دواکەوتووییە، ئەم داخراوەییەی عەقڵی دەسەڵاتی کوردی، لە سەردەمی هیچ نەسلێکی ڕابردوودا، وێڕای دەسەڵاتی داگیرکەر؛ نەیهێشتووە هیچ پەنجەرەیەک بەسەر هیچ کولتوورێکی ڕۆژئاواییی (غەیری کولتووری ئیسلامی) بکرێتەوە؛ هەر بۆیەش هیچ ڕۆژنامە و گۆڤارێک و چاپخانەیەک یان هیچ ژانرێکی ئەدەبیی (غەیری شیعر) بە زمانی کوردی نەنووسرا کە بێت ژیانی ئەو زەمانە پیر و پەڕشکاوەمان بۆ بگێڕێتەوە.

بەڵام لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بەملاوە، شاعیرانی گەنجی کورد، بێداردەبنەوە و وێنەیەکی ڕەخنەگرانەی گشتیمان پێ دەبەخشن لەبارەی دواکەوتەیی و ستەم. حاجی قادری کۆیی لە هەموویان بوێرتر ڕەخنە دەگرێ:

بلێ بەو سەرکزۆڵەی کوزپەرستە
بە چاوی کلدراو و ڕیشی پانی
کە نەفعێکت نەبێ بۆ دین و دەوڵەت
بە من چی نەقشەبەندی یانە مانی

حاجی قادری شاعیری دنیادیدە، کە سەرگەڤازی نەوەی تازەی گەنجە کوردەکانە و ماوەیەکی درێژی تەمەنی خۆی لە ئەستەمبۆڵ بەسەربردووە؛ گازاندە لە میللەتەکەی خۆی دەکات لەوەی کە خۆیان تەنیا لەناو چوارچێوەی کۆن و سواوی گوندەکانی خۆیاندا ئابڵوقە داوە و ناچن بزانن ئاخۆ گەلانی پێشکەوتووی جیهان گەیشتوونەتە چ بەختەوەری و ئازادی و پێشکەوتنێک لە سای زانست و تەکنەلۆژیا.. پێیان دەڵێ:

یەکتان نەچوونە گەردش واتێدەگەن لە دونیا

هەر پادشاهی ڕۆمە و شاهی عەجەم لە تاران

یان بە گلەییەوە دەڵێ:

نیسبەتی ئێمە و ئوڕووپا قەترەیی دەریا نیە

بۆچ ئولولعەزمێک بە عەزمی بەعثەتی پێی تەڕ نەبوو؟

ئنجا هانی گەنج و خوێندکار و ڕۆشنبیرانی گەنجی کورد دەدات بچن دەروازەکانی بیرکردنەوەی خۆیان بەسەر جیهانی پێشکەوتووی ئەورووپادا ئاوەڵا بکەن و بێن سوود لە ئەزموون و زانست و هونەر و تەکنەلۆژیای گەلانی پێشکەوتووی ئەورووپا وەربگرن:

بۆ فەننی حەرب و سنعەت بۆ زەبط و ڕەبطی میللەت

دەینێرنە ئۆڕووپا گەورە و بچووکی خۆیان

ڕاستییەکەیشی، وەرگرتنی ئەورووپا وەک مۆدێلێک بۆ بنیاتنانەوەی کوردستان و وەک مۆدێلێک بۆ دروستکردنی شەخسیەتی کورد، لای زۆربەی نووسەر و ڕووناکبیرە گەنجە کوردەکان، ڕەوتێک و خاسیەتێکی بیرکردنەوە بوو.



زۆربەی نووسەرە گەنجە کوردەکان جیهانی ڕۆژئاوایان وەک نموونەیەکی گەیشتن بە ئازادی، وەک مێتۆدێک و ڕێگایەک لەپێناو گەیشتن بە بەختەوەری تەماشا دەکرد. ئەمەتا لە لاپەڕە (١٨)ی ژمارە (٤) گۆڤاری (ڕۆژی کورد)، لە ١٩١٣، (کوردی) ناوێک لە وتاری (ئەسڵ و نەسلی کورد)دا دەڵێ:

ئێمە ئیدیعا ئەکەین و دەڵێین ئەڵمان لە عرقی کوردە. ئەسبابی چیە ئەو ئەوەندە تەرەققی کردووە و ئێمەش بە جاهیلی ماینەوە؟ ئەسبابی مەعلومە، چونکە ئەوان بەر لە هەموو چشت نیفاقیان ڕەفع کرد، دەستیان دایە دەستی یەکتر، مەعاوەنەتی یەکتریان کرد، مەکتەبیان گوشاد کرد، مەعاریفیان تەعمیم کرد، لەپاشانا مەیلیان دایە سنعەت. ئەڵمان لە سنعەتا ئەوەندە متەرەقیە کە ئینسان حەیرانی ئەفعالی ئەو بێ. مەسەلا تەیارە، باڵۆن دروست ئەکا بەقەدەر مەسافەی نیوەی ئاسمان بڵند ئەبێ و کەشفی هەموو کائینات ئەکا. عەمەلەی ئەو فابریق مانگی بە سەد لیرە ئیش ئەکەن چونکە چشتی وەک تەیارە دروست ئەکەن... ئێمە، کەی چوار کەسمان جەمع بووین و تەدبیری ئیسلاحی ئەم قەومە بەدبەختەی خۆمان کرد؟ کەی پارەدار بۆ تەعمیمی مەعاریف ئیعانەی دا؟

بەم شێوەیە لەناو ئەدەبیاتی گەنجە کوردەکاندا، واتە لەناو گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانیاندا دەیان نموونە و وتار و بۆچوونی پێشکەوتووخوازی ئاوها دەدۆزینەوە کە سیستەمی

ژیانی ئەورووپا و مۆدێلی شارستانیەتی جیهانی ڕۆژئاوا بە نموونە دەهێننەوە بۆئەوەی گەلی کوردیش چاویان لێ بکات و سوودیان لێ وەربگرێت.

سورەییا ئەمین عالی بەدرخان (١٨٨٣-١٩٣٨) لە خولی سێیەمی ڕۆژنامەی (کوردستان) کە لە (١٩١٧-١٩١٨) لە قاهیرە دەرچووە زنجیرە وتارێکی نووسیوە لەبارەی سیستەمی فیدرالیزم و کۆنفیدرالیزم لە ولاتانی ئەورووپادا کە بێگومان تا ڕۆژی ئەمرۆش سوودی لێ وەردەگیرێ. ناوبراو باسی فیدرالیزم لە ولاتانی ئەورووپا دەکا بۆئەوەی قەناعەت بە سیاسەتمەدار و ڕووناکبیرانی کورد بهێنێت کە دەشێ سیستەمێکی فیدرالیی هاوشێوەی ئەوان لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیشدا پیادە بکرێت لەپێناو ژیانی سەربەخۆیی و ئاسوودەی گەلی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا شانبەشانی تورک و ئەرمەن و گەلانی دیکەی «عوسمانی».

سەرهەڵدانی ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم و بیری واقیعگەرایی پاشانیش سەرکەوتنی شۆڕشی چەوساوەکان لە ئۆکتۆبەری١٩١٧ لە ڕووسیا بەسەر بیری زۆریەی قوتابی و نووسەرە گەنجە کوردەکانی سالانی چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەم ڕەنگی دایەوە؛ بەتایبەتیش بەسەر نووسەرە گەنجەکانی سالانی (١٩٣٠). هاوزەمانی ئەمەش، جەنگی یەکەمی جیهانی ١٤-١٩١٨بە هەموو ڕووداوە دڵتەزێنەکانییەوە کاریگەریگەریی هەبوو بەسەر دیدی خوێندکار و گەنجە نووسەرەکانی ئەو ماوەیە، ئەمەتا حەمدی دەڵێ:



ساعیقە و بەرقی نەدامەت زوڵمەتی دا شەرق و غەرب
بەردەبارانە بە مەخسووسی لەسەر موڵکی بابان
گوێی فەلەک کەڕ بوو لەبەر ناڵەی نەفیری ئەهلی شار
لامەکانی گیرا سەدای ناڵە و فوغان و ئەلئەمان

هەموو ئەم ڕووداوە هەژەندانە وایانکرد بیری مرۆڤی گەنج و تێگەیشتنی جوانیناسیی لاوانی کورد گۆڕانێکی گەورەیان بەسەردا بێت: وای لێیان کرد لە بیرکردنەوەی کۆنی ئیسلامەتی و خەلوەتنشینی و غەزەلسەرایی و سۆفیگەری، واتە لە مزگەوت بێنە دەرەوە و بچن چارەسەرێک بۆ واقیع بدۆزنەوە. مەلا محەممەدی کۆیی، کە بۆ خۆیشی مەلا بوو، تەوژمی ڕەخنەگرتنی بەهێزتر، دەیگوت: (کورد..

مەلاییێکیان هەیە سندانی لێدا
نەخوێندە و ئەحمەق و پووچ و نەزانە
وەکو کەر گڕ دەخوا دائیم لە دێدا
بە ڕیشی پان دەڵێی مالی جووانە
ئەویش بۆ شێخ وەکو کەلبی موعەللەم..
مەلاکانیش لە حەقیان زۆر خەیانن
ئەوانیش هەر دەڵێی گەوج و نەزانن
لەباتی باسی دین و ڕوکنی ئیمان
مەلا بۆیان دەخوێنێ مەدحی شێخان...
خولاسە چەند خورافاتێکی دیکە
مەلا نەقڵی دەکا بەو فاک و فیکە

عەوامی قوڕبەسەر وەک وا دەزانن
جەنابی شێخ بە خزمی خوا دەزانن
ئەوانە شێخیان لەلا خودایە
حیسابی وان لەسەر تەوقی مەلایە.

ڕاپەڕینە نەتەوەییەکان، نارەزایی و یاخیبوون لەهەمبەر دەسەڵاتی ناوخۆ، ئافاتەکانی جەنگی یەکەمی جیهان، بەشێوەیەکی گشتیش بارودۆخە هەڵایساوەکە وای لەو گەنجانە دەکرد بچن واقیعگەرایانە ڕووبەڕووی واقیع ببنەوە؛ ئەدەبیاتی خۆیان لە واقیعەوە هەڵبگۆزن.. لە تراژیدیای نیشتیمانەکەیان بدوێن و لەپێناو خۆشترکردنی ژیانی نەوەی نوێ تێ بکۆشن. عارف صائیب، سەرگەردان و تووڕە، دەیگوت:

ڕۆژێ خەبەری حەرب و دەمێ موژدەیی سوڵحە
ئوفتادە لەناو دەغدەغەیی خەوف و ڕەجا خۆم
بێ مەسکەن و بێ چادر و یاغمورلغ و یاتاغ
عوریان و پەرێشان بە مەسەل گورگی چیا خۆم
باران و قوڕ و دەهشەت و سەرمایە بە هەر جا
پاماڵی دەسی شیددەتی بەفر و ڕەشەبا خۆم

هەمموو کارەساتەکانی ئەو سەردەمە ببوونە هەوێنی بیرکردنەوەیەکی خۆبەخشانەی گەنجەکان، ببوونە کەرەستە و بابەتی نوێی دەربڕین. ئەوڕەحمان بەگی نفووس دەیگوت:

من نەکوژرێم تۆ نەکوژرێی نیشتیمان وێران ئەبێ
صەد هەزار ئینسان بەجارێ مەحوو و سەرگەردان ئەبێ



پەرەسەندنی دیمۆگرافی لەناو شارەکاندا و دروستبوونی شارە گەورەکان هۆکارێکی دیکەی دروستبوونی ئەو بزاڤە ڕووناکبیرییە بوو کە ئێمە لێرەدا ناومان ناوە (پرۆژەی مەعریفیی گەنجە کوردەکان).

کاتێ شاری پاریس لە سەدەکانی چواردە و پازدەمدا ڕاپەڕی، ژمارەی دانیشتووانەکەی دوو سەد هەزار کەس بوو و ئەوکاتە پاریس تاقە پایتەختێکی هەرە گەورەی هەموو ئەورووپا بوو؛ ئەوکاتە پاریس دەمێک بوو ببوو بە شار. هەر بۆیەش یەکەمین جار ڕاپەڕین لە پاریس دەستی پێکرد. لەوانەیە یەکێک لە هۆکارەکانی ئەوەیش کە شۆڕشی فەرەنسا (١٧٨٧) و شۆڕشی کۆموونەی (١٨٧٠) هەر لە پاریسەوە دەستی پێکرد، هەمان هۆکاری دیمۆگرافی و کۆمەڵایەتی و شارنشینی بووبێت.

کەواتە شارنشینی Urbanisation ڕۆڵی هەیە لە زەمینە خۆشکردن بۆ یاخیبوونەکان. ڕاستییەکەیشی؛ ڕاپەڕین و یاخیبوونەکان لەو کاتانەوە دەستیان پێکردووە کە شارۆچکەکان وردە وردە دەستیان کردووە بە گەشەسەندن و بوونەتە شار.

لە کوردستانی سەدەکانی ڕابردوودا، تا کۆتایی سەدەی نۆزدەمیش، بەپێی ئەو سەرژمێری و پیشاندانانەی ئەولیا چەلەبی و گەڕاڵە ئەورووپاییەکان کردوویانە: هیچ شارێکی کوردستان نەبووە کە ژمارەی دانیشتووانەکەی لە سێ هەزار کەس تێپەڕ بکات. هەزاران گوند و لادێ، سەدان قەزا، دەیان ناحیە و شارۆچکە هەبوونە. هەر یەکێک لەوانە عەشیرەتێک، بنەماڵەیەک یان تیرە و خێڵێک تێیدا جێنشین مەژوولی

کشتوکاڵ و ئاودێری و مەڕوماڵات و ڕەز و باغی خۆیان بوونە و
بێ خەبەر لە گوندێکی ئەولاتریان: هەمووشیان یەکانگیر خزمی
یەکتر لەژێر سێبەری ئاغای خۆیان سوێندیان بە سەری یەکتر و
ئاغای خۆیان خواردووە؛ بەدەگمەن ڕێک کەوتووە مسکێن و
وەرزێرێک یاخی ببێت و لە قسەی ئاغای خۆی دەرچووبێت:
ئیتر چ جای موستەعیدێک یان فەقێیەک یان گەنجێک بۆئەوەی
پێی بگوترێ «دەمڕووت» و شاربەدەر بکرێت!

ئەگەر شار لە کوردستاندا دروست نەبووبێت: هۆیەکەی ئەوە
بووە کە ئەو زەوییەی لە گوند کێڵدراوە، ئەو ڕەز و بژوێن و
کێڵگە و باغانەی سوودیان لێ دیتراوە زۆر شیرین و ئازیز
بوونە، نەکراوە بەجێ بهێڵدرێن لەپێناو هیچ: لەپێناو شار!

جگە لەمەش پەیوەندیی خێڵەکی و تیرەپەرستی لەنێو گونددا
زۆر بەهێز بووە. هیچ هۆ و ئامانجێک بە هیچ شێوەیەک
نەیتوانیوە ببێتە پاساوی ئەوەی کە فەقێیەک یان گەنجێک یان
جوتیارێک بچێتە گوندێکی لە گوندەکەی خۆی گەورەتر.
پەیوەندییە بنەماڵەییە گەرم و عەشیرەتگەرییە توندوتۆڵەکە
ڕێگەی نەداوەتە هیچ کەسێک لە ناوچەکەی خۆی
دووربکەوێتەوە: مەگەر بەدەگمەن مەلایەک لەپێناو خوێندنی
زیاتر چووبێتە شارۆچکەیەکی لەوەی خۆی گەورەتر، یان تەنیا
لەو کاتەی «سیامەندێک» خەجێیەکی هەڵگرتبێ.

بەم شێوەیە، لە سەدەکانی ڕابردووی پێش کۆتایی سەدەی
نۆزدەهەمدا، پێویست بوو چاوەڕێی ئەوە بکەین کە سەبارەت بە
هەر هۆیەک بووبێت خەڵک وردە وردە لە گوند و لادێکانەوە



بەرەو شارۆچکەکان کۆچ بکەن (بۆ نموونە وەک ئەوەی کە
خەڵک لە سنە و شارەزوور و هەڵەبجە و قەڵاچوالان و
شوێنەکانی دیکەوە بەرەو شارۆچکەی سلێمانی کۆچیان کرد و
سلێمانییان دامەزراند!).. پێویستە چاوەڕێی ئەوە بکەین کە -
لە ئەنجامی کۆچی خەڵک لە گوند و لادێکانەوە- چەند
شارۆچکەیەکی کوردستان وردە وردە گەشە بستێنن تا لە
سەدەی بیستەمدا دەگەنە ئاستی شار.

بەپێی سەفەرنامەکەی مستەر ریچ: هەولێر لە ساڵی
١٨٣٢دا تەنێ قەڵاتێک بووە لە ناوەڕاستی دەشتێکی چۆڵ و
هۆڵدا، بەڵام دووای کۆچکردنی خەڵکی گوندەکانی کرمانجەتی
«عەلیاوە، عەوێنە، باداوە.. » هەروەها دووای کۆچکردنی
عەشیرەتەکانی مەنتک، دزەیی، گەردی، خەیلانی و خۆشناو
بەرەو هەولێر، لە ساڵانی (١٩٢٠-١٩٤٠) بەملاوە، هەولێر
ئیتر گەیشتە ئەوەی خاسیەتەکانی شار دروست بکات و
دیمۆگرافیای بەرزتر ببێتەوە و پێکهاتەیەکی یەکگرتووی نوێ
بەخۆیەوە ببینێت: بەشێوەیەک کە تاکەکەس ئیتر لەژێر
فەرمایشتی ئاغادا نەمێنێتەوە، چیتریش هێندە پابەندی مەرج
و نەریت و ئیلتیزامەکانی عەشیرەت یان مەلا نەبێت.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بەدوواوە تاکەکەسی کورد لە
دەروەستبوونی بۆ ئاغا و مەلا و مزگەوت و عەشیرەت دابڕا،
کەوتە ناو چەند پەیوەندییەکی نوێوە: پەیوەندیی لەگەڵ مودیری
فەرمانگە، قوتابخانە، مەئموور، کارگەکان. ئەم دەزگایانەش
وەک دەزانین شێوازێکی دیکەی پەیوەندین: ترس و پیرۆزییان

(وەک عەشیرەت) تێدا نیە، نەرمترن، زیاتر سەربەستییان تێدایە، زیاتر بواری گفتوگۆ و بیرکردنەوەیان تێدایە. هەر ئینسانێک دەتوانێ -ئەگەر خۆی بیەوێت- تێیاندا ئازاد ڕەفتاربکات و ئازادانە بیر بکاتەوە، تەنانەت لە کاتی ناڕازی بووندا ناڕەزاییش دەربڕێت. ئەم ئازادییەش لەناو شاردا (لەناو فەرمانگە و کارگەکاندا) وەک دەزانین، یەکەمین هەنگاوە بەرەو «خۆڕێکخستن». ئەم ئازادییە لەناو فەرمانگە و کارگە و بەڕێوەبەرایەتییەکاندا، لە کاتی چەوسانەوە و زوڵمدا نەک ڕێگەت لێ ناگرێت، بەڵکو هانیشت دەدات کە لەسەرەتادا «هاوارێک» بکەیت. هەمووشمان دەزانین هاوار سەرەتای هەموو یاخیبوونێک و ڕاپەڕینێکە..

مەتەڵێکیش هەڵناهێنین ئەگەر بڵێین: شاری گەورە لە سەرەتادا لە دەرەوەی سنووری کوردستاندا دروست بوونە: ئەستەمبۆڵ، قاهیرە، بەغدا، تاران، دیمەشق، مووسڵ؛ بەتایبەتیش ئەستەمبۆڵ، چونکە یەکەمین ئەو شوێنانەیە کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە سیفەتی شار وەردەگرێت و پاشان دەیان نووسەری یاخی و نەسلێکی ڕاچەنیوی گەنجی کورد دروست دەکات. حاجی لە مەتحی ئەستەمبۆڵدا دەڵێ:

سەوادی ئەعزەمی قوستەنتەنییە
گەلێ بێ ناوی کردە صەدری ئەعزەم

دووای دامەزرانی ئەستەمبۆڵ ئنجا وردە وردە شارۆچکەکانی وەک سنە و سلێمانی و هەولێر و کەرکووک و دیاربەکر و بەتلیس و مەهاباد گەشەیان سەند و بوونە شار.



لە سۆنگەی ئەو شتانەی باسمان کرد، کەواتە، هیچ سەیریش نیە ئەگەر دەبینین یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی (کە وەک یاخیبوون و ڕاپەڕینێکە) لە شارێکی گەورەی پایتەختی وەک قاهیرە سەری هەڵداوە، یەکەمین گۆڤاری کوردی لە پایتەختێکی وەک ئەستەمبۆڵ بڵاوکراوەتەوە، هەروەها یەکەمین قوتابخانە مۆدێرن (١٩٠٨) و ڕێکخراوە خوێندکارییەکان (١٩١٢) و ڕێکخراوەکانی ژنان (١٩١٩) و ئەوانی ڕووناکبیرانیش (١٩٠٨) دیسان هەر لە ئەستەمبۆڵی پایتەختدا سەریانهەڵداوە.

تەنیا لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوەیە کە شار بە مانای تەواوی وشە لە کوردستاندا دروست دەبێت: تەنیا لەو کاتەشەوەیە کە زۆرانبازی لەنێوان نەوەکاندا Conflit des Generations بەشێوەیەکی دیار و توندوتیژ لە کوردستاندا سەرهەڵدەدات؛ بەشێوەیەک کە وەک هوشیارییەک دەنووسرێتەوە، وەک ڕاپەڕینێکی گەنجانە خۆی دەسەلمێنێت.

لەو کاتەوەی شار دروست دەبێ، پەیوەندییە عەشایەرییەکان هەڵدەوەشێنەوە و قەدری هۆز هێندە نامێنێ؛ ئینتیما بۆ عەشیرەت و بەگوێکردنی سەرۆک هۆز کەم دەبێتەوە. لێرەوە چەمکەکانی ئازادی و دیموکراسی و مەدەنیەت و مافی ئافرەت و ئازادیی تاکەکەس و سەرەتاکانی یاخیبوون و دەربڕینی ناڕەزایی، لای ئەو گەنجە کوردە ناڕازییانەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم چەکەرەیان کرد و لە چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەمدا گەیشتنە ئەوپەڕی بووژانەوە.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، ژمارەیەکی زۆری گەنج و قوتابیانی کورد، لە هەر چوار پارچەکەی کوردستانەوە، روویان کردبووە بەتایبەتی ئەستەمبۆڵ و ئنجاش پایتەختەکانی ولآتانی ڕۆژئاوا.

ئەستەمبۆڵ، وەک قاهیرە، لەو سەردەمەدا، ببووە مەڵبەندێکی رۆشنگەر و تیشکهاوێژی ئەوتۆ کە نووسەر و رۆشنبیرانی نەک تەنیا کورد، بەڵکو ئەوانی زۆربەی میللەتانی وەک عەرەب و تورک و ئەرمەن و بوڵگاری و چەرکەس و فارس و هی دیکەشی تێدا کۆببۆوە؛ ئاڵوگۆڕێکی کولتووریی فراوانی تێدا ئەنجام دەدرا و ڕەنگی دەدایەوە بەسەر توێژی نووسەر و لاوانی کورد.

ئەستەمبۆڵ، ئەم پایتەختە رەنگینە فرە کولتوورە، ببووە پردێک کە بیری رۆشنی هەموو جیهان و کولتووری هەموو ئەورووپای بە دنیای دوواکەوتووی میللەتانی رۆژهەڵات، لەوانە کوردیش، دەگەیاند.. وەک حاجی قادری کۆیی - کە بۆ خۆی هەر لە ١٨٣٩یان لە ١٨٥٤ بەمەلاوە وەک گەنجێکی دنیادیدە لە ئەستەمبۆڵ لەناو ئەزموونەکەدا ژیاوە- دەڵێ:

سەوادی ئەعزەمی قوستەنتەنییە
گەلێ بێ ناوی کردە صەدری ئەعزەم

دروستبوونی ئەم پەیوەندییە قووڵەی نێوان رووناکبیری گەنجی کورد لەگەڵ جیهانی رۆژئاوا لەرێگەی ئەستەمبۆڵەوە، فاکتەرێکی بەهێزی دیکە بووە بۆ گەلآڵەبوونی ئەم پرۆژە مەعریفییەی گەنجە کوردەکان. ئەمەش چونکە لەسەر دەستی ئەو نووسەر و رووناکبیرە گەنجە کورد دوورەولآتانەوە بوو کە بیر



و نووسین، بیری کوردپەروەی و ئەدەب، تێکەڵ بە یەکتر بوون؛ چەمکی تازە لەبارەی ژیان و هونەر و شارستانیەت لەدایک بوون؛ کۆمەڵێک پێشبینی و تێگەیشتنی هاوچەرخ، بیروڕای تازە سەریان هەڵدا.

ئەو رووناکبیر و نووسەرانەی کە بەشێکی تەمەنی گەنجێتیی خۆیان لەوێ بەسەربرد؛ لە ١٩٢٣ بەمەلاوە، دووای قەدەغەکردنی زمان و کولتووری کوردی و راوەدوونانیان لەلایەن رژێمی کەمالیستی تورکیاوە، پەیتا پەیتا گەڕانەوە بۆ کوردستان: حوسێن حوزنی موکریانی، پیرەمێرد، ئیسماعیل حەقی بابان، رەفیق حیلمی، ئەمین زەکی بەگ.. بۆ کوردستانی عیراق؛ هەروەها برایانی بەدرخان و عوسمان سەبری و قەدریجان و جگەرخوێن بۆ کوردستانی سووریا. لە کوردستاندا، بەتایبەتیش لە کوردستانی عیراقدا، ماڵێکی کولتووریی هێندە رەسەن و بەبڕشتیان دروستکرد کە تا ئەمڕۆش، ئێمە، لە سای بەر و سێبەری ئەواندا دەژین.

لەو زەمانەی ڕابردوودا، ئەو خوێندکار و گەنجە رۆشنبیرانە، لە ئەستەمبۆڵ و هەندێکیشیان لە پایتەختەکانی ڕۆژئاوادا، پێش ئەوەی بگەڕێنەوە ولآتی خۆشیان توانیبوویان بناغەی ئەو رێنسانسە دابڕێژن. پیرەمێرد کە لە ١٩٢٤ لە ئەستەمبۆڵەوە دەگاتەوە بەغدا هەر لەناو شەمەندەفەر ئەم شیعرە دەنووسێت و لە رۆژنامەی ژین لە ١٩٢٦/١١/١٧ بلآوی دەکاتەوە:

ئەوا ڕووم کردەوە تۆ ئەی دایکی موشەففەق بیست و پێنج ساڵە
لە غوربەتدا بە یادی تۆ دەژیم خوا شاهیدی حاڵە

# ئایا «گەنجە کوردەکان» پڕۆژەیەکی مەعریفییان هەبووە ؟

ئەگەر دیارترین سیمای کۆمەڵگەی مەدەنی کاری ڕێکخراوەیی و خەباتی سیاسی بێت (لەجیاتی جموجۆڵی چەکداری و عەشایەرگەری) ئەوا «گەنجە کوردەکان» دەبنە یەکەمین گرووپی ئەو رووناکبیرە کوردانەی دەیانویست لە کەناڵێکی مەعریفی و مەدەنییەوە تێ بکۆشن بۆ گۆڕینی کۆمەڵگە.

«گەنجە کوردەکان» بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کورددا هاتن خەباتی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی چەکدارییان تەرجەمە کردە سەر خەباتێکی کولتووری، خەباتی ئەپستمۆلۆژییان لەجێگەی میلیتاریەت و چەک دانا؛ زۆربەی ئامرازەکانی ئەو پڕۆژە مەعریفییەشیان تاقی کردەوە: هەر لە پەخشکردنی بیر و بۆچوونەکانی خۆیان و بایەخدان بە زانست و هونەر و پەروەردە و دامەزراندنی ڕێکخراوە جۆراوجۆرەکانەوە بگرە تا دەگاتە یەکەمین جار خەباتی ڕۆژنامەنووسی و چاپەمەنی و نوێکردنەوەی ئەدەبیات.

لە بەستێنی ئایدیۆلۆژیاشەوە دەبێ ئاماژە بەوە بدەین کە تەنیا یەک هێڵی بیرکردنەوەی سیاسی بۆ خەبات و بۆ چۆنیەتیی چارەسەرکردنی کێشەی کورد، واتە بۆ چۆنیەتیی ئاسوودەبوونی ئینسانی کورد، نەبوو؛ بەڵکو چەندین ڕێگا و چەندین ئایدیۆلۆژیای جۆراوجۆر هەبوون. ئەمەش بێگومان



هەرگیز بە خەوشێک ناژمێردرێت، بەڵکو نیشانەی ئەوە بوو کە خودی کۆمەڵگەی کوردەواری پێکهاتەیەکی تێکەڵ و فرە توێژ و فرە ڕەهەندی هەیە، ئەمە جگە لەوەی کە ژێوپۆلەتیکی کوردستانی دابەشکراویش بەسەر زیاتر لە تەنیا یەک داگیرکەر ڕۆڵی هەبوو لە مەسەلەی دروستبوونی ئەم فرە ئایدیۆلۆژیای لەو زەمانەوە لەناو گەنجە کوردە یاخییەکاندا سەری هەڵدا.

میقداد-مەدحەت بەدرخان لە (١٨٩٨) لە قاهیرە دەیویست سوڵتان تەنیا ئازاری کوردان نەدات و لێیان گەڕێ بۆ خۆیان بە زمانی کوردی بنووسن. عبدالرحمن بەدرخانی برای، لە ژمارەی پێنجەمی هەمان ڕۆژنامەوە ستراتیژ و وتارەکانی خۆی لەهەمبەر سوڵتان توندوتیژتر کرد و داوای ریفۆرمی دەکرد. سوررەییا بەدرخانی سەر بە هەمان بنەماڵەش لە (١٧- ١٩١٨) بەملاوە پێشنیاری چارەسەری فیدراڵیی یان کۆنفیدراڵیی دەکرد بۆ کێشەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا. بەڵام ژەنەراڵ شەریف پاشا، گەنجێکی دیپلۆمات و ئەورووپادیدەی تر، ڕادیکاڵێکی عوسمانی بوو و لە پاریس حیزبی ڕادیکاڵی عوسمانیی دامەزراند: پێی وابوو کورد و تورک و ئەرمەن و چەرکەس و هەموو گەلێک پێویستە پێکەوە خەبات بکەن و پێکەوە لە چوارچێوەیەکی عوسمانیدا ئازاد و بەختەوەر بژین، کەچی پاشان لە ١٩١٩ بەملاوە بەتەواوەتی لەم ئایدیۆلۆژییەی خۆی پەشیمان بۆوە و لە کۆنفرانسی نێودەوڵەتیی ئاشتی لە پاریس داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی بۆ کوردستانێکی ئازاد ڕاگەیاند. لە لایەکی دیکەوە فیکری لوتفی

دیاریەکری، گەنجێکی ڕووناکبیری هەمان سن و ساڵی ئەمان،
لە (١٩١٣) باوەڕی وابوو نابێت کورد سەربەخۆ بژیت و لە
دەوڵەتی عوسمانی جودا بێتەوە. لە ژمارە (٤)ی گۆڤاری
(ڕۆژی کورد) دەیپرسی:

«ئایا ئەگەر نەتەوەی کورد بە شێوەیەکی جگە لە خەباتی
(جودابوونەوە لە دەوڵەتی عوسمانی) تێبکۆشێ، هەرگیز و
ببڕای ببڕ پایەدار نابێ؟ جودابوونەوە ناکاتە گەردێکی ئاشتی و
ژیانێکی بێ وەی، بەڵکو دەبێتە هۆی لەناوچوون و ماڵوێرانی.
ئەوانەی کە لە ئەنادۆڵ بوونەتە کارگوزاری دوارۆژی
نەتەوەخوازی، با جارێکی دیکە بیرۆکەی هۆکارەکانی
پارچەپارچەبوون نەخەنەوە مەیدان..!».

ئەمە لەکاتێکدا هەندێ گەنجی وەک سەعید نورسی و
عبدالقادر ئەفەندیش پێیان وابوو کە کێشەی کورد پێویستە
تەنێ لە چوارچێوەی بیری ئیسلامەتیدا چارسەر بکرێ. لەوانەیە
چەندین بیروبۆچوونی دیکەش لەم بەستێنەدا هەبووبن کە
هەموویان دەچوونەوە سەر ڕێگای ئەوەی کە مرۆڤی کورد چۆن بە
ئازادی و ئاسوودەیی خۆی بگات و گەلی کورد چۆن
بحەسێتەوە!

ئەم دۆخە ئەوە دەگەیەنێ کە تاکە ڕووناکبیرێک بۆ خۆیشی،
لە قۆناغێکی ژیانی خۆیەوە تا قۆناغێکی دیکەی ژیانی،
هەمان بۆچوونی نەبووە و لەسەر هەمان ئایدیۆلۆژیای پێشووی
خۆی نەماوەتەوە. ژەنەڕاڵ شەریف پاشا و عبدالرحیم ڕەحمی
هەکاری و عبدالرحمن بەدرخان و د. عبدالله جەودەت



نموونەیەکی دیاری ئەم جۆرە ڕووناکبیرە گەنجە کوردانەن کە
چەندین وێستگەی ئایدیۆلۆژیی جۆراوجۆر لە ژیانی فیکری و
ئایدیۆلۆژییاندا دەبینرێ. د. عبدالله جەودەت لەم ڕووەوە، لە
ژمارە (١)ی گۆڤاری (ڕۆژی کورد) لە (٣٠ی مایسی ١٩١٣)
لە لاپەڕە (٤) لە پەیامێکی کوردایەتییەوە، ڕەخنە لەو هەموو
ئایدیۆلۆژیەتە جۆراوجۆر و هەر یەک بە لایەکداچووەی گەنجە
کوردەکان دەگرێت و باشان پێیان دەڵێ:

«.. ئەمەتا من بە دڵگەرمییەوە ئەم پرەنسیپە دەخەمە بەردەم
گەنجانی کورد: ئێمە لە سەردەمێک داین میللەتان دەسنیشانی
کەسایەتیی خۆیان دەکەن. وەک چۆن هەر پیاوێک ئەگەر
کەسێتیی دیار و تایبەتی خۆی نەبێ، بایەخێکی کۆمەلایەتیی
نابێ.. ئاوهاش ئەو نەتەوەیەی کەسێتیی خۆی نەبێ ناوی
ناهێنرێ و لە ئاژەڵێکی قسەکەر پتر نابێ.

ئەو سەدەیەی ئێمە تێیدا دەژین هەروا گاڵتە نیە. ئەمە
سەدەی بیستەمە. ئەو نەتەوە و تاکەکەسانەی مێژوویەکی
ڕابردوو و دوارۆژی خۆیان نەبێ ئەوا تێیدا دەبنە کۆیلە و دیلی
خەڵکی دیکە.

من دەمەوێ لە گەنجانی کورد تێ بگەم و لێیان بپرسم: ئەوان
دەیانەوێ ببن بە چی و بە چی بگەن؟ دەبێ وەڵامی ئەم پرسیارە
ڕاستەوخۆ و بێ پێچ و پەنا بدرێتەوە. ئەوکاتە دۆزینەوەی ڕێگا
ئاسان دەبێ..».





بەشێوەیەکی گشتی، پێنج ڕەوتی زۆر دیار لە خەباتی ئایدیۆلۆژی و سیاسیی گەنجە کوردەکاندا دەسنیشان دەکرێن:

١) ئایدیۆلۆژیای ئیتیحاد و تەرەقی، کە باوەڕی بە دامەزراندنی حکوومەتێکی دەستووری هەبوو بۆ سەرتاپای گەلانی «عوسمانی» بە کوردیشەوە. بەڵام لە (١٩٠٨) بەملاوە کاتێ ئیتیحادییەکان جڵەوی دەسەڵاتیان گرتە دەست و لە بنەما مرۆڤایەتییەکانی خۆیان پەشیمان بوونەوە، ئیتر هەموو گەنجە کوردەکان وازیان لێ هێنان: تەنیا چەندێکی وەک زیا گۆگالب و محمد شوکری سەگبان نەبێ کە لەناو تۆرانیزمدا توانەوە.

٢) ئایدیۆلۆژیای ئیسلامییەکان کە پێیان وابوو کێشەی کورد لە چوارچێوەی بیری ئیسلامەتیدا دەبێ چارەسەر بکرێ. سەعید نورسی و عبدالقادر ئەفەندی هەواداری ئەم ڕەوتە بوون.

٣) ئایدیۆلۆژیی عوسمانی و پان عوسمانیزم، کە پێی وابوو نەتەوەی کورد پێویستە تەنیا لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا بە ماف و داخوازییەکانی خۆی بگات، بەڵام حکوومەتی ئیتیحاد و تەرەقی لە (١٩٠٨) تەنانەت دژی ئەم چارەسەرەش هەر ڕاوەستا. کەچی هەندێک لە گەنجە کوردە ریفۆرمیستەکانی وەک (لوتفی فیکری دیاربەکری)، لەم ئیتیحاددیانە **عوسمانی تر**، خەباتیان بۆ دەکرد.

٤) ئایدیۆلۆژیای فیدڕاڵی و کۆنفیدڕاڵی، کە بۆ یەکەمین جار لای سورەییا بەدرخان لە (١٧- ١٩١٨) بەملاوە سەرهەڵدەدا.

٥) ئایدیۆلۆژیای جودابوونەوەی کوردستان لە دەوڵەتی عوسمانی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ کورد.

ئەمەش، ئەگەرچی لە هەندێ بەڵگەنامەکانی شێخ عەبیدالله نەهریدا دەبیندرێ، بەڵام تەنیا لە ١٩١٩ لای ژەنەراڵ شەریف پاشا دەگاتە ئاستێکی نێودەوڵەتی.

شایانی باسە ئەم ئایدیۆلۆژیایەی بیری جودابوونەوە لە تورکیا و دەوڵەتی عوسمانی، لە ساڵانی سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەمدا، بەتایبەتی لە کوردستانی عیراق پاشانیش لای ڕووناکبیرەکانی دوورەوڵات و بزاڤی (خۆیبوون)، پەرەی سەند و زیاتر جێگەی خۆی گرت تا ڕادەی ئەوەی کە ببووە هێڵێکی سوور و زەقی گرگرتوو لەنێوان شێخ مەحموودی تورکخواز و ڕووناکبیرە جودایخوازە گەنجەکانی وەک جەمال عیرفان و ڕەشید نەجیب و جەمیل صائب و دەیانی تر. حەمدیی شاعیر بە دەنگێکی گەنجانەی یاخی، دژی ئەم پابەندبوونەی شێخ مەحموود بە سوڵتانە تورکەکان، هاواری دەکرد:

ئەمری سوڵتانان هەموو تەکلیف و قەید و زەحمەتە
طورەی ئازادی و خطووطی شادییە فەرمانی دڵ

(فایەقی تاپۆ) بە نووسین و بە شیعرەکانیشی دەماری پیاوەتیی کوردانی دەجووڵاند و زۆر توند و تووڕەتر بەگژ ئەم تورکپەرستییەدا دەچۆوە و داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی بۆ کوردستان دەکرد:

بە مەعمووری کە مەشهووری جیهان بوو خاکی کوردستان
هەموو وێرانەیە ئێستا لە زوڵم و وەحشەتی تورکان
چیە ئەم زوڵمە ئەمڕۆ تورک ئەیکا لەم عیبادەی تۆ!
فەقیر و دەوڵەمەند، شاه و گەدا، شەو تا سەحەر ناڵان



بە زیندوو ئیکتیفا نەکرا تەعەڕوز کرایە شەخس و پیر
نە شێخی نۆدێ مەحفووز ما نە قەبری حاکمی بابان
هەموو جەستەم برینداری قوڵنگی جەیشی تورکانە
سروشکی زار زارمە بە ییللا شێوی سەرقەبران
لەناو کوردایەتی غیرەت نەماوە هەموومان قەحبەین
لە خیتتەی جزیرە تاکو ئەچیتە شاخی هەورامان
کە شێخ عەبدولسەلامیان کوشت ئەگەر بێدەنگ نەبوونایە
چ تورکێ حەددی بوو دەس دا لە نەجلی سەییدی عەدنان
ئەگەر ئەم حیزبیە تا سەر دەوام کا وای لە حاڵی کورد
ئەناڵێنن لە ئێشی زیللە و شەق و خائیب و خەسران
دە هەڵسن تاکو ئێمەش دەوڵەتێکی کوردی تەشکیل کەین
وەکو قەومی یەهوود و سرب و بولگار، ئەرمەن و یۆنان
فەلەستین و یەمەن، قەتعەی حیجاز و گورجی و ئەرمەن
هەموو بوونە قڕاڵ و ئیمپراتۆر، حاکم و سوڵتان

ڕووناکبیرێکی گەنجی دیکەی وەک جەمال عیرفان، بەدەست چەکدارانی شێخ مەحموودەوە، بووە شەهیدی ئەم ڕەوتە نەتەوەییە جوداخوازەی کە دژی سیاسەتی تورکپەرستیی شێخ مەحموود خەباتی دەکرد؛ لە ژمارە (١٢)ی (ژیانەوە) لە ٩/١٢/١٩٢٤ دەنووسێ:

«عەجەب ئەوەی تورکەکان لە حەربی عموومیەدا و ئاخریا کە بە ئێمەیان کرد هەتا ئێستا هیچ میللەتێک بەسەریا هاتووە و لە تاریخا بینراوە؟ قەصابخانەکەی بەردەرکی قشڵە نایەتە بەرچاومان؟ تەماشای گردی سەیوان و دارشەخسەکانمان بکەین

ئێسقانی مردووەکانمان کە لەبرسانا ئەمردن و فڕێ ئەدرانە ئەو دەشتە؟ بێتەوە فیکرمان..!

یەکێک لە ستراتیژەکانی ئایدیۆلۆژیەتی ئەم گەنجە کوردانە ئەوە بوو کە سیاسەتێکی دووفاقیی پۆزەتیڤیان هەبوو بەرامبەر تورک و سوڵتانە عوسمانیەکان: دژی ڕژێمی دەوڵەتی تورکیا بوون، بەڵام لە هەمان کاتدا باوەشیان بۆ هەموو پێشکەوتنێکی کولتووریی تورک دەکردەوە، هەموو جۆرە هونەر و زانست و ئەدەبیاتێکی پێشکەوتووخوازیان لێیان وەردەگرت.

عەبە هەولێری کە لە ١٩٣٦ دارالمعلمینی ریفی لە بەغدا تەواودەکا و دەچێتە ئەستەمبۆڵ. لە ڕۆژنامەی ژیان لە سلێمانی، نووسیوبەتی:

«... پار هەرچەند دەچوومە قوتابخانەی هەولێر دەنگی مامۆستا و قوتابی بە زمانی تورکیم گوێ لێ دەبوو، هەروەکو دەنگی نەکیر و مونکیر دەهشەتی دەخستە سەر ئەعسابم، بە ڕەنگزەردی و مەئیووسیەوە دەچوومە دەرەوە. عەینی حاڵیشم لە دائیرەی حکوومەت دەدی، هەر ڕۆژێکم عەزابێک بوو. ئەم ساڵە کە لە جنووبی عیراق گەڕامەوە هەولێر کە ساڵێک بوو حەسرەتکێشی کوردستان بووم، چەند خۆم بە مەسعوود زانی کە چاوم بە دائیرەی حکوومەت و قوتابخانە کەوت کە زمانی کوردی ئیستیعمال دەکەن. لەم ئەحواڵە قوتابیانی مەکتەب خۆشحاڵ و بەکەیف و ڕووبەخەندە بوون...».

بەختیار زێوەریش بە هەمان شێوە دەیگوت:



کوردینە وەرن لە خەیاڵی هونەرا بین
بۆ عیلم و ئەدەب گورج و لە ڕێگەی سەفەرا بین

عەلی کەمال باپیراغاش لە ژمارە (١٨)ی ژیانەوەدا نووسیوبەتی:

ئێستاکە طیارە هەیە من لە کەرم چی؟
من تازە لە تورکی قەبە و بێ هونەرم چی
چۆن تازە فەرامۆشی دەکا کوردی عیراقی
زوڵم و ستەمی تورک و جەفا و جەور و نیفاقی؟

ئەحمەد موختاربەگی جافیش هەمان بیری جوداخوازیی و سەربەخۆیی کوردستانی هەبوو:

من کە کوردم حەز بە ئیستیقلالی کوردستان ئەکەم
ئارەزووی دەوری تەرەققی حاکمی بابان ئەکەم

گەنجە کوردەکان زۆر باش دەرکیان بەمە کردبوو کە هێزی ئابووری، واتە دارایییەکی سەربەخۆی نەتەوەیی، فاکتەرێکی پلەی یەکەمی هەموو پێشکەوتنێکی کوردستانە و پێویستە کورد دارایییەکی سەربەخۆی هەبێت بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی سیاسی. ئەم بنەمایە یەکێکە لە پرەنسیپە سەرەکییەکانی پرۆژە مەعریفییەکەیان و لە ئەدەبیاتەکەیاندا بەفراوانی ڕەنگی داوەتەوە. لەم بارەوە دەتوانین دەیان نموونەی بیری ئاوها هەم لای شاعیران و هەم لای ڕووناکبیران بخوێنینەوە. بۆ نموونە ڕۆژنامەی ژیانەوە لە ژمارە ١٧یدا ترس دەخاتە دڵی بازرگانەکان و فەلاحەکانی تووتن ئەگەر بێتوو تورک لەجیاتی ئینگلیز بێن سلێمانی داگیربکەن، دەڵێ:

(تووتن کە ئەمڕۆ ئەساسی سەرمایەی ئەم موحیتەیە، هەمووی سەوقی بەغدا ئەکرێ... فەرەزەن خودا نەکردە ئێمە کەوتینە ژێر ئیدارەی تورکەوە و لەگەڵ حکوومەتی عیراق موخاصەمەیەکمان کەوتە بەین، ئەوسا لەپێش هەموو شتێکدا سەرمایە گورەکەمان کە عیبارەتە لە تووتنەکە بە کەرەتێ سقووط ئەکا).

یان ئەوەتا حەمدیی شاعیر دەڵێ:

ئەم ئاو و ئەرزەی ئێمە هەمانە زەرع کرێ
دەوڵەت دەبێ بە کۆڵکەش و شا بە سەپانمان

هەروەها ڕەشید نەجیب لە ژ ١٨ی ژیانەوەدا لە وتاری (تورک – کورد )دا دەڵێ:

حەفتا ساڵی تەواوە کوردی خوارەوە ئیستیقلالی داخلیشی مەحوو بووە و کەوتبووە بەردەستی تورک. لە زەرفی ئەم حەفتا ساڵە چ خێرێکی بۆ ئێمە چ موئەسەسەیەکی عالیە و صناعیەی بۆ دامەزراندین، چ تەرەقیەکی دا بە زراعەت و تجارەتمان؟ هیچ ئەندەر هیچ.

ئەحمەد موختار بەگی جاف بە شیعر هەمان بیری دەردەبڕی:

نەوجەوانانی وەتەن تەوحید ئەکەن ئەم میللەتە
هەر لە کرماشان هەتا ورمێ و سنە و بۆکانەوە
پاش قڕانی موددەعی خاکی وەتەن تەعمیر ئەکەن
ڕێگەیی ئاسن ئەچێتە هەورامانەوە
کێو و کەژ گشتی ئەبێتە باغ و قەسری گەوهەرین
بۆ تەماشا دەستە دەستە دێن لە ئینگلستانەوە



شایانی باسە، هەرچی چالاکی و کارێکی ئەو گەنجە کوردانە ئەنجامیان دابێ، واتە جێبەجێکردنی سەرتاپای پڕۆژە مەعریفییەکە و پێداویستییەکانی، هەر لە کڕینی چاپخانە و دامەزراندنی بنکە کولتووری و سیاسیەکانەوە بگرە تا دەگاتە دامەزراندنی قوتابخانەکان و چاپی کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیان.. هەمووی لەسەر حیسابی گیرفانی خۆیان ئەنجامیان داون، خەرجیی هەموو چالاکییەکانیان لە باخەڵی خۆیانەوە دەرهاتووە. چالاکییەکانیان ئەهلی یان کەسی Privit بوونە. هیچ حزبێک کۆمەکی نەکردوون و هیچ حکوومەتێک بۆدجەی پێ نەداون. ئەمەش بەپێچەوانەی دۆخی هەموو نەتەوەیەکی دراوسێ (تورک، عەرەب، فارس..) کە دیارە حکوومەتەکەیان یان دەزگا و لایەنێک لەپشتەوەیان بووە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دڵسۆزیی ئەو ڕووناکبیرە گەنجە کوردانە کە بەشێوەیەکی شەخسی و لەخۆبوردوویی، بەبێ وەرگرتنی هیچ پاداشتێک، لەپێناو ئایدیالێک، کاریان کردووە.

لە ٢٢/ ٤/١٨٩٨ میقداد- مەدحەت بەدرخان لەسەر ئەرکی خۆی یەکەمین ڕۆژنامە و یەکەمین چاپخانە بە ناوی (کوردستان) لە قاهیرە دادەمەزرێنێ. لە هەمان زەمانیشدا، فرج الله زکی الکردی، کە ئەویش ڕۆشنبیرێکی کوردی میسر بووە، چەند کتێبێکی لەبارەی کورد بە زمانی عەرەبی چاپ کردووە و لەسەر هەر یەکێکیانی نووسیوە (مطبعە کردستان). ئەمیش هەر لەسەر ئەرکی خۆی ئەم چاپخانەیەی دامەزراندووە. لە ساڵی (١٩٠٠) لە ئەستەمبوڵ ڕێکخراوی (عەزمی قەوی

جەمعیەتی) لەسەر ئەرکی فیکری ئەفەندی دیاربەکرییەوە دادەمەزرێ. ئەحمەد ڕامز کوردیزادە لەناو ڕێکخراوەکەیدا ئەندامێکی چالاک بووە و ئەویش دیسان لەسەر ئەرکی خۆی لە (١٩٠١) کۆمەڵەیەکی زانستی دادەمەزرێنێ، بەڵام پاشان سوڵتانی عوسمانی لە (١٩٠٤) دووری دەخاتەوە بۆ میسر و ناوبراو لە قاهیرە درێژە بە چالاکییەکانی خۆی دەدا.

بەم شێوەیە، هەموو ڕۆژنامەکان، هەموو گۆڤارەکان، هەموو قوتابخانەکان، هەموو ڕێکخراوەکان، هەموو کتێبەکان، هەموو چاپخانەکان، هەموو چالاکی و پێداویستی و ئامرازەکانی جێبەجێکردنی ئەم پڕۆژە مەعریفییە، لەسەر ئەرکی خودی ئەو ڕووناکبیرە گەنجانە - خۆیان بەڕێوە چووە.

ئەمەیە ڕۆڵی گەنجی کورد، ئەمەیە ڕۆڵی ئەو خوێندکار و نووسەرە لاوانەی کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ئاوارەی ئەستەمبۆڵ و قاهیرە و ژنێف و پاریس و شوێنەکانی دیکەی دەرەوەی کوردستان ببوون!

شایانی ئاماژە پێکردنە؛ سەرتاپای پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، واتە هەر هەموو مێژووی نوێی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە دوو گەنجی خوێندکاری کوردەوە دەست پێدەکات: د. عبداللە جەودەت و ئیسحاق سکووتی کە یەکەمیان کوردی مەڵبەندی عەرەبگیر بوو، ئەوی دیکەشیان کوردی دیاربەکر، هەردووکیشیان قوتابیی کۆلێژی پزیشکی



سەربازی بوون لە زانکۆی ئەستەمبۆڵ، لەژێر کاریگەرێتیی بنەماکانی شۆڕشی فەرەنسا و فەلسەفەی ڕۆشنگەریی ئەورووپا و سیستەمی پەرلەمانتاری؛ پێش هەموو شتێک هاتن (ئینسکلۆپێدیای ئیسلام، چاپی فەرەنسی دەڵێ) لە ئەستەمبۆڵ، لە ڕۆژی ١٨٨٩/٥/٢١ شانەی یەکەمین ڕێکخراوی سیاسییان لە مێژووی کورددا (تەنانەت لە مێژووی هەموو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا) بەنهێنی دامەزراند: ڕێکخراوی (ئیتیحاد و تەرەقی).

ئەم دوو قوتابییە گەنجە کوردە، کە دوو ڕووناکبیری ئەرمەن و چەرکەسیشیان لەگەڵدا بوو، لە سەرەتادا - لە ڕۆژی ١٨٨٩/٥/٢١ - بریتی بوون لە تەنیا چوار قوتابیی گەنج: دووانیان کورد و یەکیان چەرکەس(محەمەد ڕەشید) لەگەڵ یەکێکی دیکەی ئەرمەن.. ناویان لەم یەکەمین کۆبوونە نهێنییەی خۆیان نا (دۆرت لار اجتماعی) واتە (کۆبەندی چوار کەسەکە). پاشان بوونە یازدە، ئنجا بوونە دوازدە و ناویان لە خۆ نا (ئۆن ئیکی لار ئیجتیماعی) واتە (کۆبەندی دوازدە کەسەکە). ئنجا ژمارەیان گەیشتە پازدە قوتابییەک لە چوارچێوەی زانکۆی ئەستەمبۆڵدا لە کۆلێژی پزیشکی سەربازی. ئنجا وردە وردە ژمارەیان گەیشتە دەیان و سەدان کەس و لە کۆتاییدا بوونە ڕێکخراوێکی جەماوەریی هێندە فراوان کە داوای لەناوبردنی سیستەمی سوڵتانەتی و ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانییان دەکرد و ئامانجیان ئەوە بوو کە سیستەمێکی «نیمچە عەلمانی» و پەرلەمانتاری و دیموکراسی

یان فیدراڵی دابمەزرێت کە ماف و ئازادییەکانی تاکەکەس و هەموو توێژ و دین و نەتەوە و چینێک مسۆگەر بکات.

لە ساڵیادی شۆڕشی مەزنی فەرەنسا، واتە لە ١٨٨٩/٧/١٤ لە شاری پاریس، هەندێک لە ئەندامەکانی سەرکردایەتیی ڕێکخراوی ناوبراو یەکەمین کۆنگرەی خۆیان بەست. لەو کۆنگرەیەدا ئیبراهیم تەمۆی ئەلبانی و محەمەد ڕەشیدی چەرکەس و ئەحمەد ڕەزای تورکیش بەشدار بوون. بەستنی یەکەمین کۆنگرەکەی ڕێکخراوێک لە ڕۆژی هەڵگیرساندنی شۆڕشی فەرەنسا، ئەوە دەسەلمێنێ کە ڕێکخراوی ناوبراو پابەندی پرەنسیپ و بنەما بەشەردۆست و دیموکراتەکانی ئەو شۆڕشە بوونە.

جگە لەو دوو گەنجە کوردە (د. عبدالله جەودەت و ئیسحاق سکووتی) دەیان ڕووناکبیری کوردی گەنجی دیکەش لە میسر و ژنێف و پاریس و تەنانەت لەناو ئەستەمبوڵیش بەنهێنی، بوونە ئەندامی خەباتگێڕی ئەم ڕێکخراوە نهێنییەی (ئیتیحاد و تەرەقی)، دیارترینیان: عبدالرحمن بەدرخان کە ئەوکاتە لەنێوان ژنێف و فۆلکستۆن دەژیا، میقداد - مەدحەت بەدرخان کە ئەوکاتە لەنێوان قاهیرە و ئەستەمبوڵ دەژیا، ڕەزا گۆگالب (لە ئەستەمبوڵ)، ئنجا حیکمەت بابان و ئیسماعیل حەقی بابان، هەروەها ژەنەڕاڵ شەریف پاشای خەندان کە لە ١٨٩٨/٧/٩دەبێتە باڵوێزی دەوڵەتی عوسمانی لە ستۆکهۆڵم بەلام لەژێرەوە ئەندامێکی چالاکی ئەم ڕێکخراوەی (ئیتیحاد و تەرەقی) بوو دژ بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.



شایانی باسە، ئەم ڕێکخراوە «کە دوو گەنجی کورد دایانمەزراندبوو!» لەکۆتاییدا ناویان لێنرا (تورکە گەنجەکان) کە لە ١٩٠٨ کوودەتایەکیان بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا هێنا و دەسەڵاتیان گرتە دەست.

بەم شێوەیە لە ١٩٠٨ بەملاوە، وردە وردە چەندین ڕێکخراوی دیکە و یانەی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵەی کولتووری، لەلایەن دەستەی جۆراوجۆری گەنجە کوردەکانەوە لەپێناو پتەوکردنی پڕۆژە مەعریفییەکەیان و لەپێناو وەدیهێنانی ئامانجە کولتووری و نەتەوەییەکانی کورد دروست دەبن:

- لە ١٩ /٩/ ١٩٠٨: ڕێکخراوی «کوردستان تەعالی و عەزمی قەوی جەمعیەتی». شەریف پاشا و عەبدولقادر شەمزینی و ئەمین عالی بەدرخان لفە ئەستەمبۆل دایانمەزراند. هەندێ مێژوونووس وای بۆ دەچن کە ناوی (کورد تەعاون و تەرەقی جەمعیەتی) بووە. ڕۆژنامەیەکیان لە ١٩٠٨ بڵاودەکردەوە بە ناوی (کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی)؛ پیرەمێرد سەرۆک نووسینی بوو؛ سەعید نوورسی و د. عبدالله جەودەت و ئیسماعیل حەقی بابان و چەندین نووسەری دیکە لەو گۆڤارە دەیاننووسی. لە ٢٥ی ئەیلوولی هەمان ساڵ یانەیەکی ڕۆشنبیریی کوردیشیان کردەوە.
- هەر لە ١٩٠٨ خەلیلی خەیاڵی (کە بەوە ناودارە چەند کتێبێکی بە کوردی و قامووسێکی کوردیشی نووسیوە و داویەتیە ڕەزا گۆگالب بۆئەوەی پێیدا بچێتەوە و کەچی ڕەزا

گۆگالب لێی فەوتاندووە)، لەگەڵ هەندێ هاوڕێی رووناکبیری دیکەی، لە گەڕەکی (گیوو بەگ پاشا) لە ئەستەمبوڵ کۆمەڵێکیان دامەزراند بە ناوی «جەمعیەتی تەعاون و تەرەقی» پاشان چاپخانەیەکیشیان بۆ بلاوکراوەکانی کۆمەڵەکەیان دامەزراند.

– لە ١٩٠٨/٩/٢٥: ژەنەراڵ شەریف پاشا، لە ئەستەمبۆڵ، لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخان و شێخ عەبدولقادری شەمزینی و داماو ئەحمەد و زولکەفەل پاشا... کۆمەڵەی (کورد تەعالی و تەرەقی جەمعیەتی) دادەمەزرێنن. لە هەمان رۆژدا یانەی کۆمەڵەکەش لە ئەستەمبوڵ دەکرێتەوە و نوێنەری شاری مووش، رەشید بەگ، وتاری کردنەوەی یانەکەی تێدا دەخوێنێتەوە.

– دیسان لە ١٩٠٨ کۆمەڵەی (نەشری مەعاریفی کوردی) لە ئەستەمبوڵ دادەمەزرێت و خوێندنگەیەک بۆ منداڵانی کورد لە ناوچەی (چەنبەرلی تاش) دروست دەکا.

حکوومەتی گەنجە تورکەکان واتە سەرکردایەتیی رێکخراوی ئیتیحاد و تەرەقی، کە ئەوکاتە (لە ١٩٠٨) کەوتبووە دەست چەند گەنجێکی تورکی شۆڤینیستەوە، (دووای بەهارێکی کەمخایەنی زەرد) لە پرەنسیپە دیموکرات و مرۆڤایەتییەکانی خۆیان لەهەمبەر ماف و ئازادییەکانی کورد پەژیوان بوونەوە. ئەمەش بەپێچەوانەی ئەو بەڵێن و پرەنسیپانە بوون کە بەپێی کۆنگرەی حیزب لە ساڵی ١٩٠٧ لە پاریس: دەبوایە خودموختاری بدەنە کورد.



هەر لەو ساڵەدا (١٩٠٨) دووای ئەوەی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی (تورکە لاوەکان) هاتنە سەر حوکم، دووای چەند مانگێک، دەمودەست حیزبی فەرمانڕەوای ناوبراو کەوتە دژایەتیکردنی ماف و ئازادییەکانی کورد. پێش هەموو شتێک، ئەو تورکە گەنجە شۆڤینیستانە، چوون لە مانگی ١٩٠٨/١٢ رێکخراوە کوردییەکەی (کورد تەعاون و تەرەقی جەمعیەتی)یان داخست؛ دکتاتۆرییەتێکی سەختیشیان سەپاندە سەر ئازادییەکانی گەلی کورد و هەر هەموو چالاکییە کولتووورییەکانیان.

لەم بەستێنەدا ژەنەراڵ شەریف پاشا، کە تا ئەم ساڵەش خۆی بە دڵسۆز و لایەنگیری ئیتحادییەکان دەزانی، سەبارەت بەم هەڵوێستە تۆرانچێتییە دەرهەق بە کورد، لێیان هەڵدەگەڕێتەوە و دژیان دەوەستێ. ناوبراو یەکێک دەبێت لە یەکەمین ئەو گەنجە کوردانەی لە گەنجە تورکەکان (واتە لە ئیتیحاد و تەرەقی) تووڕە دەبێت و واز لە حیزبەکەیان دەهێنێ! دووای ئەویش د. عبداللە جەودەتی دامەزرێن و عبدالرحمن بەدرخان، ئنجا وردە وردە هەموو گەنجە کوردەکان (مەگەر تاک و تەرایەکی وەک ڕەزا گۆگالب و محمد شوکری سەگبان نەبێت کە تەنانەت دەچن خۆشیان بە تۆرانی ناونووس دەکەن!)

بەم شێوەیە، کۆتایی ساڵی (١٩٠٨) دەبێتە کۆتایی پەیوەندیی گەنجە کوردەکان بە گەنجە تورکەکانەوە، دەبێتە ساڵی دامەزراندنی رێکخراوە کوردییە نەتەوەییەکان بە مانای تەواوی زاراوەی «نەتەوە»؛ (چونکە جاران ئیتیحاد و تەرەقی

ڕێکخراوێکی عوسمانی و گشتی بوو: ئەندامانی هەر هەموو نەتەوەیەک دەیتوانی تێیدا خەبات بکات!). «٥»

بەم شێوەیە، دەبینین: وازهێنان لە (ئیتیحاد و تەرەقی) و وازهێنان لە ئایدیۆلۆژییەتی پان عوسمانیزم، خێری تێدا بوو: بووە هۆی ئەوەی کە گەنجە کوردەکان بگەڕێن بەدوای ناسنامەیەکی نەتەوەیی و دۆزینەوەی خەباتێکی کوردستانیی پڕ بە وشەی «ناسیووناليزم» بۆ نەتەوەکەیان: ئەگەرچی لەسەرەتادا چەند ڕووناکبیرێکی وەک د. عبداللە جەودەت سەرگەردان و دوورەپەرێز مابوونەوە.

وازهێنان لە (ئیتیحاد و تەرەقی) و وازهێنان لە ئایدیۆلۆژییەتی پان عوسمانیزم و فیدراڵیزم و ڕادیکاڵیزم.. وای کرد کە ئەو توخمانەی جموجۆڵی ناسیووناليزمی کورد پێکدەهێنن، هێدی هێدی، لەیەکتری کۆببنەوە؛ لە کۆتاییشدا پرۆژەیەکی مەعریفیی کوردانە و ئەدەبیاتێکی سەربەخۆی جیاواز و کولتوورێکی نەوژەنی ئەوتۆ لەناو کورداندا دروست ببێت کە هەندێ لە مێژوونووسان بە «ڕێنسانسێکی کولتووری» ناوزەدی بکەن.

لە مانگی ١٩٠٩/١ یەکێک لەو گەنجە کوردە سیاسەتمەدارانەی کە مەترسییەکی گەورەی بۆ سەر حکوومەتی ئیتیحادییەکان هەبوو، ژەنەڕاڵ شەریف پاشا، میانەی لەگەڵ سەرکردایەتیی حکوومەتی ئیتحاد و تەرەقی تێکدەچێ: لەسەر ئەوەی کە ئیتحادییەکان ڕازی نابن ناوبراو ببێتە باڵوێزی



دەوڵەتی تورکیا لە پاریس. ئیتر لە مانگی شوباتی ١٩٠٩ ژەنەڕاڵ شەریف پاشا دەچێتە پاریس و لە ناوەڕاستی ١٩٠٩ حزبێک بە ناوی (حزبی رادیکاڵی عوسمانی) دژ بە حکوومەتی ئیتحادییەکانی تورکیا، لە شاری پاریس دادەمەزرێنێت و لە ١٥/١٠/١٩٠٩ گۆڤارێک بە ناوی (مەشرووتییەت) کە ئۆرگانی حزبەکەی خۆیەتی، لە پاریس بڵاو دەکاتەوە کە تا مانگی شوباتی (١٩١٤) بەردەوام دەبێت و (٥٥) ژمارەی لێ بە زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی لێ بڵاو دەکاتەوە. لە هەمان کاتیشدا ناوبراو، لە ماوەی ١٩١٠- ١٩١٤ پێوەندییەکی بەردەوام و پتەوی، لەپاریسەوە، هەبووە لەگەڵ هەموو (جەمعییەت) و (کلووب) و (شەخسیات) و ڕێکخراوە نهێنییەکانی کوردستان، بەتایبەتیش لەگەڵ ئەوانەی ئەستەمبوڵ و قاهیرە و ژنێف. بەم شێوەیە، «مەسەلەی کورد» لەڕێگای گۆڤارەکەیەوە دەگەیەنێتە ئاستی گفتوگۆی دیبلۆماسی و نێودەوڵەتی.

جگە لەمە، بە کردەوەی سیاسیانەش هەمان کار دەکات: لە سەرەتای ١٩١٤: شەریف پاشا لە حکوومەتی ئینگلیزەکان نزیک دەکەوێتەوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا: لەگەڵ بیرس کۆکس، باڵوێزی بەریتانیا لە پاریس کۆدەبێتەوە و ئامادەیی خۆی نیشان دەدات بۆ هاوکاریکردنی حکوومەتی بەریتانیا لەبارەی نەخشەدانانێک بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا.

بەدەر لەم ڕیزپەڕییەی ژەنەڕاڵ شەریف پاشا، کە تا ساڵی ١٩١٤ هەر لە چوارچێوەی خەباتێکی ڕادیکاڵی عوسمانیدا مابۆوە، زۆربەی هەرە زۆری گەنجە کوردەکانی دیکە، لە ١٩٠٨ بەملاوە بەرنامەی خەباتیان بریتی دەبێت لە خەباتێکی نەتەوەیی و ڕزگاریخوازی ناسیوونالیستانە. ئیدی وردە وردە ڕێکخراوی نەتەوەیی - کولتووری - کۆمەڵایەتیی سەر بەم هێڵە ناسیوونالیستە دامەزران:

- لە ١٩١٢-١٩١٤ کۆمەڵەی ئیستیخلاسی کوردستان لە ورمێ لە ساڵی ١٩١٢، لەلایەن سەید عەبدوڵڵای کوڕی شێخ عبیداللەی نەهری، بە هاوکاریی سەید تەهای نەهری و سمکۆ ئاغای شکاک دامەزراوە.
- لە ١٩١٢ یەکەمین ڕێکخراوی خوێندکارانە، ڕێکخراوی تەڵەبەی کوردا بە ناوی (هێڤی) دادەمەزرێت، کە پێشتر لە ١٩١٠/١/١٠ دامەزرابوو، بەڵام لە ١٩١٢ مۆڵەت وەردەگرێت. ژەنەراڵ شەریف پاشا لە ژمارە (٤٧)ی گۆڤارەکەی خۆیدا (مەشرووتیەت) نامەیەکی پیرۆزبایی بە زمانی فەرەنسی بەبۆنەی دامەزراندنی (جەمعیەتی هیوای طەلەبەی کوردان) بڵاو دەکاتەوە و داوا لە گەلی کورد دەکات کە خەبات پتەوتر بکەن بۆ ئەوەی «لەدەست ئەو بەڵایەی وڵاتەکەمان ڕزگارمان ببێت کە ناوی ئیتیحادو تەرەقییە».
ناوبراو لە هەمان وتاردا پیرۆزبایی لە دەرچوونی گۆڤاری (ڕۆژی کورد) دەکات.



بەڕاستیش ئەم ڕێکخراوە خوێندکارییەی (هێڤی)، کە گۆڤارێک و کلۆپێک و بەرنامەیەکی تێر و تەسەلی چالاکیی هەبوو لەناو ئەستەمبوڵ و چەند لقێکیشیان لە هەندێ پایتەختەکانی ئەورووپا هەبوو؛ بە یەکەمین ڕێکخراوی خوێندکاری دەژمێردرێت لە مێژووی کوردستاندا؛ بە پردێکی پتەو دادەندرێت بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی نەوەی تازە و پڕۆژە مەعریفییەکەی گەنجە کوردەکان. ژمارەیەکی یەکجار ئەندام و کادری بەتوانایان هەبوو لەناو زۆربەی شارە گەورەکانی کوردستانی گەورەدا.
د. عبدالله جەودەتیش، کە ئەوکاتە ئەویش لە ئیتیحادییەکان هەڵگەڕابۆوە، لەڕێگەی گۆڤاری (ڕۆژی کورد)ەوە بە وتارەکانی خۆی پشتگیریی لە بزاڤی کولتووری و ناسیوونالیستی کورد دەکرد؛ هەر ئەویش بوو بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کورددا، لە وتارێکی ناو گۆڤاری ناوبراودا پێشنیاری ئەوە دەکات کە ڕێنووسێکی تایبەت و پتەو یان لاتینی بۆ زمانی نووسینی کوردی دابمەزرێت.
- لە ١٩١٣ کۆمەڵەی جیهاندانی لە شاری خوی لە کوردستانی ئێران، عبدالرزاق بەدرخان دایمەزراند و پاشان لە ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩١٣ قوتابخانەیەکی هەر لەناو جەمعیەتەکەدا کردەوە. زمانی رووسی و کوردییان تێدا فێری منداڵان دەکرد.
- لە ١٩١٥ : لوتفی فیکری دیاربەکری، لەگەڵ چەند روشنبیرێکی دیکەی کورد پارتی موجەددید لە ئەستەمبوڵ

دادەمەزرێنێ؛ داوای جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت و دابڕانی
خەلافەت لە سوڵتان دەکا. شەریف پاشا باسی ئەم هەڵوێستە
نوێخوازەی لوتفی فیکری دیاربەکریی کردوە لە یەکێک لە
ژمارەکانی گۆڤارەکەی خۆی (مەشرووتیەت).

– لە ١٩١٨ کۆمەڵەی (کوردستان تەعالی جەمعیەتی) لە
ئەستەمبوڵ، کە شێخ عبدالقادری شەمزینی سەرۆک و ئەمین
عالی بەدرخان جێگر بووە. ئەندامەکانیشیان: حیکمەت بابان،
مستەفا شەوقی، محەمەد میهری، هەمزە موکسی، مەمدووح
سەلیم، ع. ڕەحمی هەکاری، عەزیز یامولکی، کەمال فەوزی.
هەر ئەم کۆمەڵەیەش پشتگیری بڵاوکردنەوەی گۆڤاری (ژین)ی
کردووە. لە هەمان ساڵدا کۆمەڵەی (کوردستان ئیستیقلال
جەمعیەتی) لە قاهیرە لەلایەن سورەییا بەدرخان دامەزراووە.
هەروەها لە هەمان ساڵدا یانەی کوردی لە دیاربەکر لەلایەن
ئەکرەم جەمیل پاشاوە دامەزرا.

– لە مانگی گوڵانی ١٩١٩، لە ئەستەمبوڵ بۆ یەکەم جار
(کۆمەڵەی پێشکەوتنی ژنانی کورد/ کورد قادینلار تعالی
جمعیەتی ) دادەمەزرێت لە پێناو گرێدانەوەی خەباتی
ئافرەتانی کورد بە خەباتی نەتەوەییەوە.

پێویستە ئاماژە بەوە بدرێ کە بایەخدان بە مەسەلەی ئازادیی
ئافرەت و کارکردن لەپێناو مافەکانی ژنان، یەکێک بوو لە
پرەنسیپە دیارەکانی پرۆژە مەعریفییەکەی «گەنجە کوردەکان».
لە زۆربەی گۆڤار و ڕۆژنامەکانیاندا لەسەر ئەم مەسەلەیە
ڕادەوەستان و وتاریان لەسەر بڵاودەکردەوە و بەکردەوەش –



لەڕێگەی یانە و ڕێکخراوەکانی خۆیانەوە- کاریان بۆی دەکرد.
ئەمەتا نووسەرێک بە ناوی (ی. ج) خەڵکی ئەرغەنی
مەعدەن، لە ساڵی (١٩١٣) لە گۆڤاری (ڕۆژی کورد) لە ژ
(٤)، ل ١٢دا هەموو هاوڕێ خوێندکار و گەنجە ڕووناکبیرەکانی
خۆی ئاگاداردەکاتەوە و دەنووسێ:

«گەنجە کوردەکان دەبێ دەرکی پێ بکەن کە مەسەلەی ژن و
خێزان مەسەلەی ژیانە. پلەی بەرزێتیی میللەت و مرۆڤایەتی
هەمیشە بە هاوشانی و یەکسانیی ژنان دەبێ...».

– لە ١٩١٨ لقێکی جەمعیەتی تەعاون لە دیاربەکر کرایەوە
و ناوی نرا یانەی کورد (کورد کلۆبی). دکتۆر جەودەت بەگ
جێگری سەرۆک بوو، کەریم جەردیس زادە ژمێریار بوو. نزیکەی
دوو هەزار ئەندامی هەبوو لەوانە محەمەد میهری و دکتۆر
فوئاد. لە کۆتاییدا ڕێکخراوێکی دیکەی لێ دامەزرا بە ناوی
(تەشکیلاتی ئیجتیماعیە)؛ ئەمین عالی بەدرخان و شوکری
بابانزادە و عەبدوللا جەودەت و ئەکرەم جەمیل پاشا سەر بەم
ڕێکخراوە بوون. گۆڤاری ژین لە ١٩١٩ کە گۆڤارێکی
نوێخوازی ئەدەبی و ڕۆشنبیری بوو، ئۆرگانیان بوو.

– ئەحمەد خواجە دەڵێ: "کۆمەڵەی لاوانی کورد" کە لە
هەولێر لە ١٩٢١ دامەزرابوو، لە هەولێر شانۆگەریی
سەلاحەدینیان پێشکەش کردووە. عبداللە عزیز کارگەچی و
ئەحمەد فەخری سامی و عبداللە سامی ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە
بوون و بەشدارییان لەو شانۆگەرییەدا کردووە. بڵاوکراوەیەکی
دەسنووسی ڕەخنەیی توندوتیژیان هەبوو. عبدالخالق قطب و

محمد محمود قودسی و تاهیر سادق و مستەفا خۆشناو خیرالله عبدالکریم و سەید نظیف کۆبی ئەندامانی دیکەی ئەم کۆمەڵەیە بوون''.

– هەروەها لە (١٩٢٣) ژمارەیەک گەنجی ڕووناکبیر لە بەغدا ئەوانیش کۆمەڵەیەک بە ناوی (لاوانی کورد) دادەمەزرێنن بۆ بڵاوکردنەوەی بیر و هۆشی کوردی، مستەفا صائیب موعتەمەدیان بووە و شاکیر فەتاح سکرتێریان.

– لە ١٩٢٢ کۆمەڵەی کوردستان لە سلێمانی کە مستەفا عەزیز پاشا و ڕەفیق حیلمی و ساڵح قەفتان و ئەحمەدبەگ و شوکری عەلەکە دایانمەزراندووە و گۆڤارێکیان بە ناوی (بانگی کوردستان) دەرکردووە. ئامانجی سەرەکییان بریتی بووە لە پشتیوانیکردنی شۆڕشی شێخ مەحموود.

– لە ٢٤/٢/١٩٢٦ کۆمەڵەی زانستیی کوردان لە سلێمانی، کە ئەحمەدیەگی تۆفیق بەگ و کەریم زانستی و ڕەفیق حیلمی دایانمەزراندووە. تیپی شانۆیی قوتابخانەی زانستی کە سەر بەو کۆمەڵەیەی (زانستی) بووە لە سلێمانی، لە ١٩٢٦ دامەزراوە، چەندین بەرهەمی شانۆیی هەبووە. جگە لە پیشاندانی فیلمی سینەمایی لەناو ئەم جەمعیەتەدا.

– لە ٢٠/٥/١٩٣٠ یانەی سەرکەوتن لە بەغدا دادەمەزرێت لەلایەن مەعرووف جیاوک و ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری و ئەمین زەکی بەگ و مەحموود جەودەت بەگ و خەڵەف شەوقی داودی و ئەحمەد ئاغای کەرکووکلی زادە..





د. عبدالله جەودەت لە ساڵی ١٩٠١ لە ژمارە (١٧)ی ڕۆژنامەی (کوردستان) لە قاهیرە، بە گەنجە کوردەکان (بە دەستەی نووسەرانی کوردستان) دەڵێ:

**ئەو پەیامەی کە خستووتانەتە ئەستۆی خۆتان خەباتێکی زۆر پیرۆزە.. سەرکەوتن هەر بۆ ئێوەیە.**

هەموو ئەم كۆمەڵە ڕۆشنبیری و ڕێكخراوانە، كە دەیان ڕووناكبیر و سەدان گەنج بەشدارییان تێدا كردووە و ئەندامییان بوونە، یەكێكە لە نیشانە و بەڵگەكانی هەبوونی ئەو پرۆژە مەعریفی و ژیانە مەدەنییەیە كە تازە لەناو كورداندا پەیدا ببوو.

لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە، هەر لەسەر دەستی یەكێك لەو گەنجە كوردە دیپلۆماسییانەیە كە بۆ یەكەمین جار لە مێژوودا «كێشەی كورد» لەسەر ئاستی ناوخۆ و ناوچەییەوە بەرزدەبێتەوە ئاستێكی جیهانی: ژەنەڕاڵ شەریف پاشا داخوازینامەیەک پێشكەش دەكاتە كۆنفرانسی نێودەوڵەتیی ئاشتی لە پاریس لە ساڵی ١٩١٩دا لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتێكی سەربەخۆی بۆ كورد. دیسان هەر بۆ یەكەمین جار لە مێژوودا، هەمان ئەو گەنجە ڕووناكبیرە كوردە نەخشەیەكی كوردستانی گەورە دروست بكات و وەک ئامرازێكی دەربرینی هەستی نەتەوەیی، لەناو داخوازینامەكەیدا بە ئەركی بخات.

دەستاوەردێكی ئاپستمۆلۆژیی دیكەی گەنجە كوردەكان، گۆڕینی سیستەمی خوێندن و پەروەردە بوو: دامەزراندنی قوتابخانەی مۆدێرن، قوتابخانە لەشێوەیەكی نوێدا بە مێتۆدێكی هاوچەرخ و بە ناوەڕۆكێكی پێشكەوتووی ئەوتۆ كە لەگەڵ دۆخ و پێداویستییەكانی زەمانی نوێ بگونجێ.

زەمانی كلاسیک، واتە زەمانی پێش «گەنجە كوردەكان» سیستەمی خوێندن كە پێی دەگوترا (فەقێیاتی) یان (خوێندنی



حوجرە) سیستەمێكی كۆن و دوواكەوتووی ئیسلامی بوو. بەپێی قۆناغی یەک لەدووای یەكی خوێندن بەم شێوەیە بووە: سوختە، موقەدمیات خوێن، ناسكە موستەعید ، موستەعید. ئەو بابەت و دەرسانەیش كە لە حوجرە و و مەدرەسەكاندا دەگوترانەوە (قەید و تەذبیب و شەرح و حاشیەكان...) دیارە وەک حاجی قادری كۆیی دەڵێ بەرباد و بێكەڵک بوونە، نەک هەر سوودێكی ئەوتۆیان نەگەیاندۆتە فەقێكان بەڵكو بەربەستێكیش بوونە لەبەردەم پێشكەوتنی كورد.

بەدرێژایی سەدان ساڵ هەمان سیستەمی كۆن، هەمان كتێبی پەرپووت، هەمان دەرسی سواو، هەمان مەعریفەی باو خۆی دووبارە كردۆتەوە: بێ ئەوەی هیچ ئەبستمۆلۆژیایەكی نوێ دابهێندرێت كە لەگەڵ واقیعی تازەی كوردستان و لەگەڵ ژیانی جیاوازی ئینسانی جیاوازی سەدەی بیستەم یەک بگرێتەوە. تەماشاكە گەنجێكی یاخیی وەكو حاجی قادری كۆیی، كاتێ خوێندنی فەقێیاتی تەواو دەكات و ڕوودەكاتە ئەستەمبۆڵ، چۆن لەوێ چاوی دەكرێتەوە و تێدەگا كە زۆربەی ئەو مەلا و مامۆستا و موفتییانەی كوردستان چەند بێسوود بوونە، چۆنیش هەر هەمان سیستەمی خوێندن لە كوردستاندا ببووە بەربەستێک لە بەردەم پێشكەوتنی قوتابی و گەنجی كورد:

ئێستە مەعلوومی بوو هەموو میللەت
ئەی مەلای دەرس و موفتیی ئوممەت
قەید و تەذبیب و شەرح و حاشیەكان
بوونە سەددی مەعاریفی كوردان

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، نووسەر و ڕووناکبیرە «گەنجە کوردەکان» دەست دەکەن بە ڕەخنەگرتن. بێداردەبنەوە و دەزانن کە لەپێناو وەدیهێنانی ڕێنسانسێکی کولتووریدا پێویست وایە پرۆژەیەکی مەعریفی دابمەزرێت. بۆ ئەم مەبەستەش دێن پێش هەموو شتێک قوتابخانەی نوێ، واتە قوتابخانەی سەر بە سیستەمی مۆدێرن دادەمەزرێنن. ئەم قوتابخانە و خوێندنگە مۆدێرنانەش بێگومان ڕۆڵێکی دیاریان هەبوو بەسەر بووژاندنەوەی رۆشنبیری و نەشونمای جموجۆڵی کولتووری.

لە سەردەمی عوسمانییەکاندا، لە ١٨٩٢ تا ١٩٠٧ لە ئەستەمبۆڵ قوتابخانەیەکی گشتی بە ناوی (عەشیرەت مەکتەبی) هەبوو کە منداڵانی کوردیش دەیانتوانی زمانی عوسمانی و عەرەبی فێر بن. هەروەها لە سلێمانی، لە ١٨٩٣ بەملاوە قوتابخانەی روشدیەی عەسکەری کرایەوە کە دەرچووەکانی دەنێردرانە بەغدا و ئەستەمبۆڵ بە مەبەستی تەواوکردنی زانستەکانی عەسکەری. ئەمین زەکی بەگ و ئیسماعیل حەقی شاوەیس و مەعرووف جیاوک و ئەمین رواندزی.. دەرچووانی ئەم قوتابخانەیەن. سەعید صدقی حەسەن کابان لە ١٩٠٣ بۆتە مامۆستا لەوێ. ئنجا لە ١٨٩٩ لە سلێمانی مەکتەبی ئەعدادی لە سلێمانی کراوەتەوە.

دووای ئەمیش لە ١٩٠٨- ١٩٠٩ قوتابخانەیەکی دیکە بە زمانی کوردی لە ناوچەی (چەنبەرلی تاش) لەناو بینایەی



ڕێکخراوی '' کورد نەشری مەعاریف جەمعیەتی'' لە ئەستەمبۆڵ بە ناوی (کورد نموونە مەکتەب ئیپتیدائیسی – مەشرووتیەت) کرایەوە کە خەلیل خەیالی و ئەحمەد کوردیزادە دایانمەزراندبوو. مامۆستای ئەو قوتابخانەیە سەعید کوردی بووە کە ئەوکاتە سەرنووسەری رۆژنامەی (شرق و کوردستان) بووە. جەمعیەی ناوبراو لەوکاتەدا کتێبێکی ڕێزمانی و قوتابخانەیی بۆ قوتابییەکان چاپکردبوو.

پاشانیش لە ١٩١٠ قوتابخانەیەکی دیکە لە ئەستەمبۆڵ لە گەڕەکی دیوانلی دادەمەزرێ، عبدالرحمن بدرخان مامۆستا بووە و مانگی ٣٠ لیرەی عوسمانلی لە باخەڵی خۆی لە خەرجیی ئەو قوتابخانەیە سەرف کردووە.

دوواتریش لە ١٩١٣/١/٤ قوتابخانەیەکی کوردیی دیکە لەلایەن عبدالرزاق بەدرخان لە (خوی) لە کوردستانی ئێران دەکرێتەوە: ئەلف و بێی ڕووسی و ئەدەبی ڕووسی و زمانی کوردی فێری قوتابیان دەکەن. سمکۆ ئاغای شکاک هاوکاریی دەکردن. لە هەمان ساڵ و شوێندا (کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کوردستان) چاودەکاتەوە.

لە شاری سلێمانیش لە ١٩٢٠/٨/١٧ دەبینین لە مەکتەبی نموونەی سەعادەت قوتابی قەید و قبووڵ دەکرێ و لە یەکی مانگی سێپتەمبەری ١٩٢٠ رۆژی چوار شەممە مەکتەب دەکرێتەوە و دست بە دەرس خوێندن دەکرێ. حکوومەت کتێب، دەفتەر، قەڵەم، کاغەز، مەرەکەب، تەباشیریان ئەداتێ و هیچیان لێ ناسێنێ».

لە ماوەی ١٩٠٧– ١٩١١ شێخ عبدالسلامی بارزانی یاداشتێک دەداتە دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە ئەستەمبوڵ کە تێیدا داوای ئەوەش دەکا کە خوێندن لە کوردستان پێویستە بە کوردی بێت. – د. کاوس قفطان: الانتفاضات البارزانیە، سلیمانیە: ٢٠٠٢، ل ٢٢

ڕووناکبیرە گەنجە کوردەکانی دیکەش، وەک ئەمین زەکی بەگ و مەعرووف جیاوک، کە هەندێکیان مەبعووس و باڵادەست بوون، لە ساڵانی بیستەکاندا کەوتنە ناردنی نامە بۆ حکوومەتی عیراق بۆئەوەی لە مەکتەبەکاندا خوێندن بکرێتە زمانی کوردی. لەسەر بنچینەی ئەم داخوازییانەش، لە ١٩٢٦/٢/١٢ نوێنەری باڵای بریتانیا لە نامەیەکی نهێنیدا پێشنیاری بۆ سەرۆک وەزیرانی عیراق کرد کە نووسینگەیەکی تەرجەمەی کوردی لە بەغدا بکرێتەوە، هەروەها تەرجەمەی قانوون و کتێبە قوتابخانەییەکان بۆ کوردی بکرێت. لە ئەنجامدا ئەم پێشنیارە، بە سەرپەرشتیی وەزارەتی مەعاریف (بەڕێوەبەری گشتیی مەعاریف) جێبەجی کرا و لیژنەیەکی وەرگێڕان دامەزرا. ئەم هەواڵە لە ڕۆژنامەی ژیان، لە ژمارە ٩، لە ١٨ی مارتی ٩٢٦دا دەنگی دایەوە و نووسییان: «لە لایەکی دیکەشەوە وەزارەتی مەعاریف ئەم ساڵ بیست طەلەبە ئەنێرێ بۆ دارالفنوونەکانی ئینگلتەرە، ئامریکا، بەیرووت، میسر. ئەمانە لە فەننی تەربیە و تەعلیم، هەندەسە، ئەلکتریک و زراعەتدا تەحصیل ئەکەن..». – ل ٣، ژیان، ژمارە (١٩٠):١٩٢٩/٨/٥.



ئنجا یەکەم کتێبی چاپکراوەی ڕەسمی لە کوردستانی عیراقدا کە بۆ قوتابخانەکان ئامادەکرا و بڵاوکرایەوە، نووسراوی مامۆستای قوتابخانەی نموونەی سەعادەت، محەمەد باشقە (١٨٩٠ ـ ١٩٨٠) کە بە هاوکاریی مێجەرسۆن و محەمەد زەکی دایناوە بە ناونیشانی (ئەوەڵەمین قیرائەتی کوردی) لە ساڵی ١٩٢٠دا لە چاپخانەی حکوومەت لە بەغدا چاپکراوە. ئنجا لە ١٩٢٦ لەلایەن ئەحمەد عەزیز ئاغاوە ( ئەلف و بێ ) لەجیاتی (ئەوەڵەمین قیرائەت) بۆ پۆلی یەکەم دانرا.

بەم شێوەیە، وردە وردە دەیان قوتابخانەی مۆدێرن کە بە کوردی دەخوێندران لە کوردستاندا کرانەوە و لە کۆتاییدا قوتابخانە بۆ کچانیش دەرگاکانیان کەوتە سەر پشت: «ئەنجوومەنی مەعاریف لە جەلسەی حەوتەمی لە ١٩٢٦/٣/٢٩ لە ریاسەتی متصرفدا، بڕیاری داوە مەکتەبێکی کچان بکرێتەوە و لە ٢١ی نیسانەوە دەستدەکرێ بە قەید و قبووڵی قوتابیی کچ». «٦»

ئەو قوتابخانە و مەکتەبانەی بە هەوڵی گەنجە کوردەکان دامەزران، جگە لە ناوەڕۆکی هاوچەرخی ئەبستمۆلۆژی و پەروەردەیی و ڕۆشنبیرییان، چالاکیی شانۆیی و کولتوورییەکانیشیان، لەناویاندا، ڕۆڵێکی مەزنیان هەبووە لە بڵاوکردنەوەی چەمکە فیکری و ڕۆشنگەری و ئەدەبیە تازەکان، هەروەها لە نوێکردنەوەی چێژی ئێستاتیکیی خەڵک. بە هەمان شێوە پێشکەوتنی جموجۆڵی هونەری شێوەکاری و گوازرانەوەی چەمکی نیگار لە میناتۆرەوە بۆ هونەری مۆدێرنی نیگارکێشان،

ئەویش هەر لە چوارچێوەی چالاکیی قوتابخانە مۆدێرنەکاندا گەشەی سەند.

هەر لەسەر دەستی ئەو گەنجە منەووەرە کوردانەدا، لە ساڵی ١٩٢٥ یەکەمین تیپی مۆسیقا لە سلێمانی بە سەرپەرشتیی عبدالواحد نوری و فوئاد ڕەشید بەکر دامەزرا. لە ساڵی ١٩٠٥ بەملاشەوە یەکەم شانۆگەرییەکان لەسەر شانۆ پێشکەشکراون و ئەم بزاڤە شانۆییە لە سەرەتای بیستەکانەوە دەکەوێتە ژیانێکی چالاکتر و پێشکەوتووترەوە. کۆمەڵەی زانستیی کوردان لە سلێمانی لە ٢٤/٢/ ١٩٢٦، کە ئەحمەدیەگی تۆفیق بەگ و کەریم زانستی و ڕەفیق حیلمی دایانمەزراندبوو سەرپەرشتیی تیپی شانۆیی قوتابخانەی زانستی دەکا کە سەر بە جەمعیەی زانستی بوو لە سلێمانی، چەندین بەرهەمی شانۆیی پێشکەش دەکا. جگە لە پیشاندانی هەندێ فیلمی سینەمایی.

جگە لەمانە، فەلسەفەی جوانیناسی ( ئێستاتیکا )، هەروەها ڕەخنەی ئەدەبی و رەخنەی هونەری شێوەکاری، یەکەم جار شێخ نووری شێخ ساڵح (١٨٩٦ـ ١٩٥٨) دایدەهێنێ. ئەمەش لەو زنجیرە وتارەی بە ناونیشانی ''ئەدەبیاتی کوردی'' لە رۆژنامەی ژیان بە (٢٥) ئەڵقە بلاوکراوەتەوە لە سلێمانی. نووسەر لەم بەرهەمەیدا هەموو بەشەکانی هونەرە جوانەکان ''صەنایعی نەفیسە'' (نیگارکێشان، مۆسیقا، پەیکەرتاشی، بیناسازی، وێنەگەری) شیدەکاتەوە .

بەم شێوەیە، ئەو ڕووناکبیرە گەنجە کوردانە، بەپێچەوانەی شێخ و موفتی و مەلا و میرە کوردەکانی سەدەکانی ڕابردوو،



بزووتنەوە کۆمەڵایەتی و نەتەوەخوازییەکەی ئەو سەردەمەی کوردستانیان لە ئاستی سەرزارەکییەوە گەیاندە ئاستی نووسین و هوشیاری و ئایدیۆلۆژیا.. بزاڤە کوردایەتییەکەیان لە ئاستی کارەسات و ڕاپەڕینە رۆژانەکانەوە گەیاندە ئاستی بە ئەبستمۆلۆژیاکردن، ئاستی بە مەعریفەکردنی کردەوەکان؛ گەیاندیانە ئێستێتیکا و هونەر و پەروەردەی مۆدێرن .. ئەمەش لەڕێگەی رۆژنامەگەری و چاپەمەنی و بلاوکردنەوەی خوێندەواری بە زمانی کوردی و کردنەوەی قوتابخانەکان و هێنانە ئارای سیستەمێکی پەروەردەیی هاوچەرخ و خوڵقاندنی زەمینە بۆ دروستکردنی مەعریفەیەکی نوێ. ئەمە کارێک بوو کە موفتی و میر و مەلا و شێخ و خاوەن تەریقەتەکانی سەردەمی کلاسیک (بە مەلای جزیری و مەولانا خالیدی نەقشبەندی و مەلا مەحموودی بایەزیدی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی و مەحویشەوە ..) هەرگیز نەیانتوانیبوو پەی بە ئەنجامدانی ببەن و جێبەجێی بکەن.

تا دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم – لە چەند شاعیرێک زیاتر – هیچ مەلا و شێخ و میر و موفتی و میرزایەک (کە منەووەرەکانی ئەوکاتە بوون) نەهاتبوون کتێبێک لەبارەی ژیان و ژن و ژانی کۆمەڵ و زانست و هەر چی شتێکی بەهاداری کوردستان بە کوردی بنووسن.. ئەمەتا شاعیرێکی گەنجی کۆتایی سەدەی نۆزدەم، حاجی قادری کۆیی، یاخیگەر، ڕەخنە لەم خەوش و خۆ بە کەم زانینیەی نەوەی ڕووناکبیرانی پێش خۆی دەگرێت و دەڵێ (حەیف):

کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کاغەز
بە کوردی گەر بنووسرایە زەمانی
مەلا و میر و پادشاما ن
هەتا مەحشەر دەما ناو و نیشانی

هیچ خواجە و خان و کوێخا و مەلا و میر و موفتی و مووریدێک (کە منەووەرەکانی ئەوکاتە بوون) هیچ نووسراوێکیان (لە شیعر زیاتر) بە زمانی کوردی نەنووسیبوو. دیسان هەمان شاعیری یاخی، کە سەر بە نەوەی گەنجی ڕاچەنیوی کۆتایی سەدەی نۆزدەیە، بە هوشیارییەکی هێرشکارانەوە دژی مەلا و «عولەما» و ئوستادە کۆنەکانمان، گەواهیمان بۆ دەدات:

هەر کوردە لە بەینی کوللی میللەت
بێ بەهرە لە خوێندن و کیتابەت

هۆی ئەم بە کوردی نەنووسینە، بێگومان، لەوەدایە کە خواجە و کوێخا و مەلا و میر و موفتی و میرزاکان، واتە نەسلی پیری دەسەڵاتدار، نەیانویستووە نەسلی گەنج و نەوجەوان و قوتابی (واتە شاگرد و سوختە و موستەعید و فەقێکان) لەو نیعمەتە بەهرەمەند بن کە ناوی خوێندەواری و ڕۆشنبیری و هونەر و زانستە! ئەمەش چونکە، هەموومان دەزانین: توانای نووسین و خوێندنەوە، یان سوودوەرگرتن لە زانست و ڕۆشنبیری و هونەر، گەنج و خوێندکاران دەگەیەنێتە لێوارەکانی یاخیبوون و ئازادی؛ ئەمەش مەترسی دروست دەکات بۆ سەر دەسەڵاتداری پیر و میر و مەلا. حاجی قادری کۆیی بۆیە لەم دۆخە تووڕەیە و



ئامۆژگاریی گەنجان دەکا:

دەستگیریت لە عەمەلدا قەت نەکا مورشیدی پیر
دەستی تۆی گرتووە، پێی بەستووی مانەندی ئەسیر

یان ئەمەتا حەمدیی شاعیر لەم بارەوە دەڵێ:

ئەو شەخصە کە ئەیکرد بە دوعا مەنعی موصیببەت
ئێستاکە بەڵایە کە دەکا دەستی بە وەر وەر
ئەو پیرە کە ئوفتادەیی مەسجید بوو لەبەر فەیض
هەڵساوە وەک فیتنە قەدی میسلی سنەوبەر

بە کوردی نووسین یان توانای کوردی خوێندنەوە، ڕۆشنبیربوون، لە دیدی ئەو مەلا و میر و منەووەرە پیرانەدا، دەکاتە: مەترسیی ئەوەی بەرژەوەندی و پایە و بەهاکانی خۆیان بەسەر خۆیاندا قەڵب ببێتەوە! بۆیە زۆربەی هەرە زۆریان، نەک هەر بەلایانەوە گرنگ نەبووە خەڵک فێری خوێندەواری و نوسین بە کوردی و خوێندنەوە بە کوردی بکەن، بەڵکو ڕێگەشیان لێ گرتووە؛ تەنیا ئەوەیان لەلا بەس بووە چەند ژمارەیەکی کەمی فەقێ و شاگرد لە حوجرەکانیاندا ڕابگرن ئەویش لەژێر سانسۆر و زەبری دارحەیزەراندا!

بەپێچەوانەی ئەمانە، گەنجە کوردەکان هاتن پێش هەموو شتێک بایەخیان دایە نووسین بە کوردی. کەواتە نووسین (پەخشان) بە زمانی دایک، خۆی لە خۆیدا پڕۆژەیەکی مۆدێرن و هەنگاوێکی نوێگەر بووە لەو زەمانەدا. چونکە نووسین مێژووی نەتەوە و نیشتیمانی کوردی لەلایەن کورد - خۆیەوە و بە کوردی تۆمار کرد!



**گەنجێتیی ئەمڕۆی کورد، ئەم ڕۆڵە خۆبەختکارانەی کوردستان، ئەگەر لە هیچەوە کوردستان بخەنە بوونەوە، کارێکی شەرەفمەندانە و بەختەوەرانەیە..**

م. بەدرخان

گ. ڕۆژی کورد، ژ (٤)، ل ١٠



هەر لێرەشەوە، دەبینین، سەدەکانی ڕابردوو خاسیەتێکی شەرمەزار و ڕوویەکی زەردی هەیە لەم بەستێنەدا ئەویش ئەوەیە کە هیچ هۆشیارییەکیان لەبارەی خۆیانەوە نەبووە؛ هیچ هوشیارییەکمان لەبارەی خۆیانەوە ناداتێ. ئەمەش بەبێچەوانەی (سەردەمی گەنجە کوردەکان) کە جورئەتی پەیدا کرد هوشیارییەک لەبارەی خۆیەوە ببەخشێت و خۆی خۆی بنووسێتەوە!

تەنانەت لە ئاستی زمانی دەربڕینیشدا، ئەو گەنجە کوردانە هەوڵیانداوە زمانێکی «بژار» و جیاواز لەچاو زمانی کلاسیکی کوردی دەکار بێنن. زمانێکی تازەیان هێنایە ئارا کە شاعیری گەورەی ئەو زەمانەمان، عبدالله گۆران ناوی دەنێت (زمانی کوردیی عوسمانلی)؛ ئەو زمانەش – بە بۆچوونی گۆران – تەواو لەژێر تەئسیری ڕۆمانتیکە تورکەکاندا بوو.«٧»

گەنجە کوردەکان لەپێناو وەدیهێنانی ئەو پڕۆژە مەعریفیەدا، بیری هێنانی یەکەمین چاپخانە کوردییەکانیشیان هێنایە دی. ئەمەش لە سەرەتادا دیسان لە دەرەوەی وڵاتدا، پاشان هێنایان بۆ کوردستانیش. پیرەمێرد دەیزانی کە هەبوونی چاپخانە و ئەم هەموو بەرهەمە کولتوورییە ڕەنگاوڕەنگە دیاردەیەکی مۆدێرنە و تایبەتە بە خەباتی نەوە تازەکەی خۆی، بۆیە دڵخۆش شانازیی بەو دەستاوەردە ئەپستمۆلۆژییانەی ئەو گەنجە کوردانەی هاوڕێکانی خۆی دەکرد و دەیگوت : «کورد صەحافە و سەقافەی هەیە...». – ڕ. ژین، ژ (٨١٧): ١٩٤٦.

یەکەمین چاپخانە کوردییەکان، کە گەنجە کوردەکان لەو ماوەیەدا لەپێناو بەڕاست گەڕاندنی پرۆژەکەیان دەستەبەریان کرد ئەمانە بوون:

١- چاپخانەی میقداد- مەدحەت بەدرخان (١٨٩٨)

لە ژمارە چواریدا نووسراوە کە ڕۆژنامەی کوردستان لە چاپخانەی سەربەخۆی ڕۆژنامەی (کوردستان)دا چاپکراوە «لمصریَ ل مطبعا جریدەیا کوردستانێ طەبع بیە». ژمارە پێنجیش لە هەمان ئەو چاپخانە کوردیەدا.

لەم دوو ژمارەیەی ڕۆژنامەی ناوبراودا هیچ باسێک لە بارەی کڕینی چاپخانە و دامەزراندنی چاپخانەیەکی سەربەخۆ بۆ ڕۆژنامەکە نەکراوە، بەڵام لەوە دەچێ کە میقدا- مەدحەت بەدرخان لەو ماوەیدا بە راستی چاپخانەیەکی سەربەخۆی بۆ بڵاو کردنەوەی (کوردستان کڕیبێت. لە هەمان زەمانیشدا، فرج اللە زکی الکردی، کە دیارە ڕۆشنبیرێکی گەنجی کوردی دانیشتووی میسر بووە، چەند کتێبێکی بە زمانی عەرەبی چاپ کردووە و لەسەر هەر یەکێکیانی نوسیوە (مطبعە کردستان).

٢- چاپخانەی ئیجتیهاد (١٩٠٤)

ڕووناکبیری کورد، د. عبداللە جەودەت (١٨٦٩- ١٩٣٢)، کاتێ لە دوورەوڵاتدا ژیاوە لە ژنێف، لە ڕۆژی ١٩٠٤/٨/٤ یەکەم ژمارەی گۆڤاری اجتهاد بەو چاپخانەیەی خۆی بڵاو دەکاتەوە لە سویسرا، هەروەها هەر لەرێگەی ئەم چاپخانەیەشەوە پرۆژەی بڵاوکردنەوەی زنجیرە کتێبێک دەگرێتە ئەستۆی خۆی، بە زمانی تورکیی عوسمانلی و فەرەنسی، کە تا



ڕۆژی مردنیشی هەر مابوو.

ئەم چاپخانەیەی د. عبداللە جەودەت بە چاپخانەیەکی کوردی لە قەڵەم دەدرێت، چونکە خاوەنەکەی کوردە؛ دووەم: لەبەر ئەوەی ئەم چاپخانەیە چەندین کتێپ و چاپەمەنی نووسەرە کوردەکانی سەرەتای ئەم سەدەیەی بە زمانی عوسمانلی لە بارەی کولتووری کورد بە چاپ گەیاندووە، هەروەها چەندین ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردیی دیکەش چ بە زمانی تورکی چ بە زمانی کورد لەم چابخانەیەی ئیجتیهادی ڕۆڵەی کورد، عەبدوڵڵا جەودەتەوە چاویان بە ژیان هەڵێناوە، بۆ نموونە: ژمارە دووی گۆڤاری (ڕۆژی کورد) لە ساڵی ١٩١٣دا و چەندین گۆڤار و کتێبی دیکەی کوردیش.

٣- چاپخانەی «تعاون و ترقی» ١٩٠٨

ڕووناکبیری کورد، زنار سیلۆپی (قەدری جەمیل پاشا) لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەڵێ: «خەلیلی خەیاڵی، لەگەڵ هەندێ هاورێی ڕووناکبیری دیکەی لە ساڵی ١٩٠٨ دا لە گەرەکی گیوو بەگ پاشا لە ئەستەمبۆل کۆمەڵێکیان دامەزراند بە ناوی «جەمعیەتی تەعاون و تەرەقی» پاشان چاپخانەیەکیشیان بۆ بڵاو کردنەوەی بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەکەیان دامەزراند.

٤- چاپخانەی کوردستان ١٩١٥

حوسێن حوزنی موکریانی (١٨٨٣- ١٩٤٧) لە تافی لاوێتیدا مەڵبەندە ڕۆشنبریە گەورەکان زۆر گەڕابوو. هەر لە تەمەنی بیست ساڵیەوە خۆی فێری زمانی هیندی وعەرەبی و تورکی و فارسی و ڕووسی و فەرەنسی کردبوو. باش لە

بایەخی چاپخانە وچاپەمەنی تێگەیشتبوو، بۆیە دوای ئەوەی رووسیای بەجێهێشت و چوو بۆ هیندستان بە رێگای ئەفغانستانەوە چوو بۆ ئەستەمبۆلی مەڵبەندی چاپەمەنی، لەوێ خۆی فێری هونەری خۆشنووسی و زانستی و چاپخانە و چاپەمەنی کرد، ئینجا دوای ئەوە چووە ئەلمانیا و لەوێ لە ساڵی **١٩١٥** دا چاپخانەیەکی بە (١٢٠) لیرەی تورک کڕی و لە هەمان ساڵدا گواستیەوە بۆ شاری حەلەب لە سووریا.

موکریانی، لە ساڵی **١٩٢٥** دا لەسەر داخوازیی سەید تەهای شەمزینیی قایمقامی ئەوسای رەواندز، چاپخانەکەی لەشاری حەلەبەوە دەگوازێتەوە شاری ڕەواندز و دەست دەکاتە بڵاوکردنەوەی زاری کرمانجی (١٩٢٦- ١٩٣٢). لە ساڵی **١٩٤٧** بەولاشەوە چاپخانەکە دەگوازێتەوە هەولێر و ناوی لێدەنرێت: چاپخانەی کوردستان.

بەم شێوەیە موکریانیی گەنج بە دامەزرێنی یەکەم چاپخانەی کوردیی تەمەندرێژ لە قەلەم دەدرێت لە مێژووی دامەزراندن و پەرەسەندنی چاپخانەی کوردیدا. بەشی هەرە زۆری کتێب و بەرهەمە چاپکراوەکان و مەعریفەی کوردستانی عیراق لەم چاپخانەیەوە لە دایک بوون.

دروستکردنی پەیوەندییەکی کولتووریی بەهێز بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کورددا لەنێوان کولتووری کوردی و کولتووری رۆژئاوادا، واتە لەنێوان نووسەرانی کورد و نووسەرانی ئەورووپادا بۆ وەرگرتنی کاریگەرییە مۆدێرنەکان و تەرجەمەکردنی بۆچوون و چەمکە مۆدێرنەکان، پڕۆژەیەکی



ئەبستمۆلۆژیی دیکەی «گەنجە کوردەکان» بوو، کە سەرکەوتووانە بەجێیان گەیاند؛ لەئەنجامیشدا رێنسانسێکی کولتووریی لێوە هاتە دی.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، بەشێکی زۆری نووسەر و روناکبیرانی کورد، لە هەر چوار پارچەکەی کوردستانەوە، روویان کردبووە ئەستەمبۆڵ: محەمەد میهری و مستەفا شەوقی لە سابلاخەوە، عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری و مەمدووح سەلیم و هەمزە بەگ و سەعید کوردی و خەلیل خەیالی و د. عبداللە جەودت و برایانی بەدرخان و قەدری جەمیل پاشا لە دیاربەکرەوە، ئیسماعیل حەقی شاوێس و پیرەمێرد و رەفیق حیلمی و مستەفا پاشا یامولکی و ئەمین زەکی بەگ و نەجدەت کەرکووکلی و حوسێن حوزنی موکریانی و ژەنەراڵ شەریف پاشا لە عیراقەوە. ئەمە جگە لە بەدری مەلاتیەلی، سەباح شەوقی، بدیع الزمان مەلا سەعید کوردی، رەفعەتی مەولانزادە، نووری دێرسیمی و دەیانی دیکەی وەک مەمدووح سەلیم بەگ کە لەدوای **١٩٢٣** دەچێتە سووریا و ئنجا لە ساڵی **١٩٢٦** لە لبنان بەشداری لە دامەزراندنی رێکخراوی (خۆیبوون) دەکا.

گرووپی نووسەرانی گۆڤاری ژین (١٩١٨ ـ ١٩١٩)، بۆ نموونە، بۆ یەکەمین جار باسی ئازادی و مافەکانی ئافرەتی کردووە، کە درەنگتر ـ لە ساڵانی بیست و سییەکاندا ـ لە ئەدەبیاتی کوردیدا رەنگی دایەوە. پشتیان بە ئێستەتیکایەکی هاوچەرخ و پێوەرە ئەدەبییە تازەکان بەستبوو، لەژێر

کـاریگەرێتـیی ئەدەبیـاتی هاوچەرخی ئەورووپی و تورکـە گـەنجـەکـاندا. هەر ژمـارەیەکی ژین ( ٢٠ لاپەڕە)، نزیکەی ٧ لاپەڕەی تەرخـانکرابوو بۆ بڵاوکـردنەوەی داهێنانی ئەدەبیی تازە و رەگـەزە تازەکـان: چیـرۆک، وتار، شـانۆنامـە، بەتایبـەتیش شیعری نوێ کە مستەفا شەوقی و عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری سەرتۆپی بوون.

شیـعـری زەمـانـی جـاران لەژێر کـاریگـەرێتـیی ئیـسـلامـدا یەکنەواخت و یەکجۆر بوو، بەڵام شیعری نوێی گەنجە کوردەکان – بەپێچەوانەوە– لەژێر کاریگەرێتیی ئایدیۆلۆژیا و فەلسەفە و رێبـازە ئەدەبی و هونەرییـە هاوچەرخ و رۆژئاواییـەکـاندا، جـۆراوجـۆرێتـیی پەیداکـرد و بووە باخـچـەیەکی هەمـەچەشن: شێوازی جۆراوجۆر، بابەتی جۆراوجۆر، تەکنیکی هەمەچەشن و فۆرمی هەمەجۆر.

تەسیراتی نووسـەرانی گرووپی(ژین) کە گرووپێکی گـەنجی نوێخـواز بوون، زۆر زوو بەسـەر کـوردسـتـانی عـیـراقـدا رەنگی دایەوە، بەتایبـەت بەسـەر نووسـەرانی تێگەیشـتنی راسـتی و پێـشکەوتن و ژیانەوە و ژیـان. لەوانەیە هەر بۆیەش ئەدەبی کوردی لە عـیراقـدا لە ١٩٢٠ بەملاوە تەکانێکی بەهێزی دایە خۆی و پێش کەوت.

لە سەردەمی کۆندا تەنانەت لە بواری وەرگێڕانیشدا، مەلا و پیاوانی دینی موسڵمان، لەلایەکی دیکەشەوە مسیۆنێرەکان، سـەرقـاڵی تەنیـا و تەنیـا وەرگـێـڕانی بەرهەمـە دینییـەکـانن: ویستـوویانە هونەر بئیـسـلامـێنن. پیـاوانی دینی مـوسـڵـمـان



تەرجـەمەی مـەولوودنامـە و میـعـراجنامـە و عـەقیـدەنامـەکـان، مسیۆنێرەکانیش تەرجومەی ئینجیل و تێکستە مەسیحییەکان. هەر دووکـیـشـیـان ئامـانجـێکی (غـەیرە هونەری و ئەدەبی) واتە ئامـانجـێکی دینی یان دینی – سـیـاسـیـیـان هەبـووە. ئەم بنچـینەیەش، وەک دەزانین، رووانین و بنەمـایەکی کـۆن و کلاسیکە بۆ داهێنان. ئەمە لە کاتێکدا لە سەردەمی نوێدا، لای ئەم گـەنجـە کـوردانە، بەهۆی ئەوەی زمـانەکـانی فـەرەنسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی و رووسی و هەندێکیان تەنانەت یۆنانی و ئەرمەنیشیان دەزانی، تەنانەت وەرگێڕانیش لای ئەوان لەپێناو واقیع و تازەکردنەوە و نوێگەراییدا بوو.

دروستبوونی ئەو پەیوەندییە کولتوورییە بەهێزە، بۆ یەکەمین جـار لە مـێـژووی کـورددا، لەنێـوان ئەدەبی کـوردی و ئەدەبی رۆژئـاوادا، واتە لەنێـوان نووسـەرانی کـورد و نـووسـەرانی ئەورووپا، بە نـوقـتـەگـۆڕان و وەرچەرخـانێکی کـولتـووری دەژمـێـردرێت. ئەم وەرچەرخـانە کـولتـوورییـەش، بەشێـوەیەکی لەسـەرخۆ و پەیتـا پەیتـا، لە مـاوەی کۆتایی سـەدەی نۆزدەم و سەرەتای بیستەمدا، لە سێ رێگەوە گەیشتۆتە ئێمە:

**یەکەم:** راسـتـەوخـۆ لەڕێگەی کـولتـووری ئەورووپا و زمـانە ئەورووپییەکانەوە.

ئەمـەش لەبەرئەوەی گـەلێک لەو رووناکـبـیـرانە لە زانکۆی پایتـەخـتـەکـانی ئەورووپا ژیابـوون؛ خـوێندبوویـان و بڕوانامـەی بەرزیـان هێنابۆوە، یان بەلای کـەمـیـیـەوە فـێـری زمـانەکـانی

فەرەنسی و ئەڵمانی و رووسی و ئینگلیزی و یۆنانی ببوون: ئەو ئەدەبیات و زمانە رۆژئاواییانەیان بەکاردەهێنا بۆ دەوڵەمەنکردن و تازەکردنەوەی ئەدەبیاتی کوردی.

میقداد – مەدحەت، مەسعوود سلێمانیەیی، لوتفی فیکری دیاربەکری، ژەنەراڵ شەریف پاشا، رەفیق حیلمی، عبدالکریم سلێمانیەلی، حوسێن حوزنی موکریانی، د. عەبدوڵا جەودەت، ئیسماعیل شاوەیس، مەمدووح سەلیم فەرەنسییان دەزانی؛ عەبدولرەحمان بەدرخان و سورەییا بەدرخان (ئەرمەنی و ئینگلیزی و فەرەنسی)، ئەمین زەکی بەگ، تۆفیق وەهبی، عبدالله گۆران، ئیبراهیم ئەحمەد (ئینگلیزی)، کامەران عالی بەدرخان و نوورەدین زازا (ئەڵمانی و ئینگلیزی و فەرەنسی)، جەلادەت بەدرخان (رووسی و فەرەنسی و یۆنانی)، عبدالرحیم رەحمی هەکاری ( رووسی و ئەڵمانی) فێر ببوون. ئەمە جگە لە زانینی تورکی یان عەرەبی و فارسی. وەک دەشزانین، ئەم نووسەرانە، هەموویان، هەر یەکە و لە بواری خۆیدا، سوودیان لە کولتوور و زمانە ئەورووپاییەکە وەرگرتووە؛ لە سەرجەم چالاکی و بەرهەمەکانیاندا رەنگی داوەتەوە؛ تەنانەت هەندێکیان تەرجەمەشیان لەو زمانە ئەورووپییانەوە کردووە.

**دووەم:** لەرێگەی ئەو ئەدەبیاتە ئەورووپییەوە کە تەرجەمە کرابووە سەر زمانی تورکی و لەلایەن نووسەرانی وەک پیرەمێرد و شێخ نووری شێخ ساڵح و نەجدەت کەرکووکلی و خەلیل خەیالی و مستەفا شەوقی و عبدالواحد نووری و جەمیل سائیب و ئەوانی ترەوە دەخوێنرایەوە.



لێرەدا پێویستە ئەوە بگوترێ کە تورکەکان پێش نەتەوەکانی دیکەی وەک عەرەب و فارس کەوتبوونە سەر تەرجەمەکردنی ئەدەبیاتی ئەورووپایی بۆ سەر زمانی خۆیان. کوردیش ئەو ئەدەبیاتە ئەورووپاییەی، بە زمانی تورکی دەخوێندەوە. هەر بۆیەش دەبینین: کورد لە سەرەتادا، لەژێر کاریگەرێتیی تورکدا دەبێت؛ پاشان دەکەوێتە ژێر کاریگەرێتیی عەرەب لە عیراق و فارس لە ئێراندا.

ئەو نووسەرە کوردانەمان، ئەورووپاشیان نەدیبوو، بەڵام لەرێگەی زمانی تورکییەوە توانیویانە پەی بە پێشکەوتن و تازەگەرییەکانی ئەدەبی ئەورووپی ببەن.

عبدالله گۆران کە باسی تازەکردنەوەی شیعری کوردی دەکات و باس لە تەئسیری شاعیرانی فەجری ئاتی ی تورک دەکات بەسەر شاعیرانی کوردەوە؛ ئەوەش دەسنیشان دەکات کە لەوکاتەدا شاعیرانی تورک، لە ئەنجامی باری تورکیا و بڵندبوونەوەی دەنگی ئازادیخوازیدا، بە رەنگدانەوەی شۆڕشی فەرەنسا و تەوژمی رۆمانتیکیی شیعری ئەورووپا، روویان کردبووە بیری تازە و، بۆ روخسار گەڕابوونەوە سەر کێشی شیعری فۆڵکلۆری تورکی. هەر لەو کاتەدا شاعیرانی کورد لاسایی ئەوانیان دەکردەوە.

هەروەها د. عزالدین مستەفا رەسوول (لە ئەدەبی نوێی کوردیدا) جەختی لەسەر ئەو راستییە دەکاتەوە، کە ئەدەبی تورکی خۆیشی – کە کاری کردۆتە سەر نووسەرانی کورد – لەژێر کاریگەرێتیی ئەورووپادا بووە، واتە نووسەرانی کورد

لەڕێگەی زمانی تورکییەوە توانیویانە دەستی خۆیان بگەیەننە ئەدەب و کولتووری ئەورووپی.

**سێیەم:** لەڕێگەی زمانی تورکی و ئەدەبیاتی نەتەوەیی نوێی تورکییەوە.

ئەدەبی تورکی لەو سەردەمەدا لەمێژ بوو، واتە پێش عەرەب و فارس، خۆی تازە کردبۆوە و کەوتبووە ژێر تەسیری پەرناس و سمبوولیزمی ئەورووپی: سەروەتی فنوون (١٨٩٠)، فەجری ئاتی (١٩٠٨)، گەنج قەڵەملار (١٩١٠).(٢٩) کاریگەرێتیی ئەدەبیاتی تورکی بەسەر کوردانی ئەوکاتەوە، لە هەموو بەستێنێکی داهێنان و ڕووانین و تەکنیک و شێواز و فۆرم و زمان و بابەتەکاندا بووە. ئەو نووسەرە کوردانەی لەڕێگەی زمانی تورکییەوە کەوتبوونە ژێر کاریگەرێتیی ئەدەبی نەتەوەیی تورکییەوە، دوو دەستەن:

دەستەی یەکەم: ئەوانەی دووربەدوور، هەر لە کوردستانەوە، ئەو ئەدەبیاتە تورکییە تازەگەرانەیان پێدەگەیشت؛ بێ ئەوەی ئەستەمبۆڵ و ناوەندە کولتوورییەکانی ئەستەمبۆڵیان دیبێت، تەنیا لەڕێگەی خوێندنەوە و موتابەعەکردنەوە موتەئەسیر بوون. بۆ نموونە، بەڵگەنامە مێژووییەکان بۆمان دەسەلمێنن کە جەمیل سائیب بەردەوام بڵاوکراوە تازە تورکییەکانی ئەستەمبۆڵی، لەلایەن پیرەمێردەوە پێگەیشتووە و کەوتۆتە ژێر کاریگەرێتیی ئەو کولتوورە تورکییەوە. هەروەها شێخ نووری شێخ ساڵح نموونەیەکی دیکەی دیاری ئەم جۆرە نووسەرانەیە، کە ڕەفیق



حیلمی – لەشیعر و ئەدەبیاتەکەیدا– لەبارەیەوە دەڵێ:

شێخ نووری شێخ ساڵح شاعیرە گەورەکانی تورکی دەوری ژیانەوە و ئینقیلابی عوسمانیی بە وردی خوێندۆتەوە. لە ئەدیبەکانی دەوری وریابوونەوەی تورک زۆر سوودمەند بووە و لە دانانی شیعری کوردییا پێڕەوی تۆفیق فیکرەت ی کردووە.

دەستەی دووەم: ئەوانەی کە لە ئەستەمبۆڵ ژیابوون و ڕاستەوخۆ لەناو ژینگە کولتوورییە تازەکەدا شێلەی ژیان و ئەزموون و کولتوورەکەیان وەردەگرت؛ تەنانەت هەندێک لەو ڕووناکبیرانە، لە زانکۆکانی ئەنقەرە و ئەستەمبۆڵ خوێندبوویان و بڕوانامەی بەرزیان هێنابۆوە، یان بەلای کەمییەوە زۆر بەباشی فێری زمانی تورکی ببوون و بەکاریان دەهێنا بۆ دەوڵەمەندکردن و تازەکردنەوەی ئەدەبیاتی کوردی. پیرەمێردی نەمر، کە نموونەیەکی دیاری ئەم دەستە نووسەرانەیە، لە ماوەی ساڵانی **١٨٩٧ ـ ١٩٢٣**دا لە ئەستەمبۆڵ ـ ڕاستەوخۆ لەناو جموجۆڵە ئەدەبییەکەدا ژیاوە ــ گەواهیمان بۆ دەدات و لە گۆڤاری (بانگی کورد)دا دەڵێ:

من لە تورکیدا هێندەی منارە خۆم بەرز ئەبینی..

یان ئەمەتا لە شوێنێکی دیکەدا کاریگەریی نووسەرانی تورک بەسەر خۆی و نووسەرانی کوردی گەنجی ئەستەمبۆڵ ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ:

" ئێمە زۆرترمان لەوێوە، لە ئەستەمبۆڵەوە، پێگەیشتووین "،

" یەکەم جار لە ئوططە دراوسێی ڕەجایی زادە ئەکرەم بەگ و عوششاقی زادە خالید زیا و حسێن ڕەحمی بووم، ڕەزا

تۆفیقیشیان پی ناساندم " ، " ئیتر کەوتمە بەهەشتی سەروەتی فنوونەوە".

ئنجا دەڵێ:

" ئێواران کە لە ئەستەموولەوە بە واپۆڕ ئەگەڕامەوە بۆ لانەی سەعادەتی خۆم کە ئوططە بوو، وە کە سەروەتی فنوونم لە گۆگرتەی ئەو واپۆڕی سەر دەریای مەڕمەڕییەدا ئەخوێندەوە، تەئسیری ئەو شیعر و ئەدەبیاتە لە سندبادی بەحری زیاتر ئەیخستمە دەریای خولیاوە ".

سەبارەت بەم ڕێنسانسە کولتوورییە کوردییەوە کە ڕەگەکانی خۆی لە ڕۆژئاواوە وەرگرتبوو، دەبینین، چەندین ژانری ئەدەبی، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، لەسەر دەستی ئەو نووسەرە گەنجە کوردانەوە لەدایک دەبێت؛ بۆ نموونە: وتاری ڕۆژنامەگەری، بە هەموو جۆرەکانیەوە (لە ١٨٩٨ بەملاوە)، چیرۆک (لە ١٩١٣ لە گۆڤاری ڕۆژی کورد)، شیعری نوێ و شیعری ستوونی (لە گۆڤاری ژین ١٩١٨)، شانۆنامە (لە ١٩١٩ لە گۆڤاری ژین)، نۆڤلێت (لە ١٩٢٥ لە ڕۆژنامەی ژیانەوە)، ، شیعری منداڵان (لە ١٩١٩ لە کوردستان و ژین)، ڕەخنە (لە ١٩١٨ و ١٩٢٤ لە ڕۆژنامەی تێگەیشتنی ڕاستی و ژیان و ژیانەوە)، (پەخشانەشیعر) لەژێر ناوی شیعری مەنسوور (لە ١٩٢٦ لە گۆڤاری زاری کرمانجی)، شیعری ئازاد (لە ١٩٣٢ لە گۆڤاری هاوار).. ئەمە جگە لە پیشاندانی یەکەمین شانۆگەرییە شێوە ڕۆژئاواییەکان لە کوردستاندا لە



ماوەی ساڵانی (١٩٠٥- ١٩٢٥) و بڵاوکردنەوەی یەکەمین دیوانە شیعری شاعیرێک کە خۆی لە ژیاندا بێت بە ناونیشانی(گازیا وەلات) لە ئەستەمبۆڵ لە ١٩١٩.

تەنانەت هەر لەو ماوەیەشدا بۆ یەکەمین جار خودی زاراوەی نوێگەری یان مۆدێرنیزم (تەجەدود و موجەدید) دەکەونە سەر زاری شاعیر و نووسەرانمانەوە. ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی) لە ساڵی ١٩١٨ لە ژمارە ٢٣ و ٢٤دا بایەخێکی تایبەت دەداتە بیری نوێخوازی لە شیعرنووسیندا؛ بۆ یەکەم جار وشەی «نوێخوازی – تجدد» بەکاردەهێنێت.

هەر لە سەردەمی ئەو گەنجە کوردانە و لەسەر دەستی ئەواندایە کە چەندین دیاردەی نوێگەری و پرۆژەی مەدەنیی دیکە دێنە دی، لەوانە:

– لە ١٩١٣ گۆڤاری (ڕۆژی کورد) بۆ یەکەم جار لە کوردستاندا وێنەی فۆتۆگرافی بڵاودەکاتەوە. هەر لەو ساڵەدا یەکەمین وێنەگری کورد لە کوردستاندا ستۆدیۆی وێنەگرتن دادەمەزرێنێت و هونەری فۆتۆ و وێنەگرتن لەناو کوردان بڵاودەکاتەوە و وێنەگرتن دەکاتە پیشەیەک: محەممەد یووسف سدیق غەزنەوی(١٨٩٤-١٩٦٤) کە خەڵکی ئاکرێ بووە.

ئنجا حسێن حوزنی موکریانی، ئەویش ئامێرێکی فۆتۆگراف لەگەڵ خۆی دەهێنێتە کوردستان و هونەری فۆتۆ لە کورستاندا گەشە پێ دەدا.

– ١٩٢٥: تابلۆ و نەخشە و تەختیتەکانی حوسێن حوزنی

موکریانی. ناوبراو یەکەم نووسەری کوردی هاوچەرخە کە کتێبی خۆی بە تەختیت و نەخشەی جوگرافی و نیگار رازاندبێتەوە: (غنچە بهارستان) زیاتر لە (٢٠) تابلۆی تێدایە.

– لە هەمان ساڵیشدا، یەکەمین تیپی مۆسیقا لە سلێمانی بە سەرپەرشتیی عبدالواحد نوری و فوئاد ڕەشید بەکر دادەمەزرێ.

– لە ١٩٢٦یەکەم جار چیرۆکنووسێکی کورد کۆمەڵە چیرۆکی خۆی بڵاوبکاتەوە: عیسا عەلی ( حوسێن حوزنی موکریانی ؟): چیرۆک بە شێوەی شیمال (کەڵەکۆک)، رواندز، ١٥ لاپەڕە. کەڵەباب؛ هەروەها حوسێن حوزنی موکریانێ: خۆشی و ترشی، کورتە چیرۆکێکە بۆ منداڵان، گفتوگۆیەکە لەنێوان گورگ و مەڕ و بزنێک (یەکەم چیرۆکە کە بۆ منداڵان نووسرابێت لە ئەدەبی کوردیدا)، رواندز، ٢٢ لاپەڕە. زاری کرمانجی لە ژ ١٠ دا دیعایەی بۆ کردووە.

– شێخ نووری شێخ ساڵح بۆ یەکەم جار رەخنەی ئەدەبی و ڕەخنەی هونەری شێوەکاری دادەهێنێ و بشەکانی هونەرە جوانەکان بە کورد دەناسێنێ: " ئەدەبیاتی کوردی" لە رۆژنامەی ژیان لە ١٩٢٦– ١٩٢٧ بە (٢٥) ئەڵقە لە سلێمانی.

بەم شێوەیە ئیتر یەکەم وتارە ئەدەبی و شێوەکاری و ڕەخنەییە شانۆییەکان و ڕۆشنبیرییە هونەرییەکان و زمانەوانییەکان و فەلسەفییەکان، لەسەر دەستی ئەم گەنجە کوردانە و لە زەمانی ئەواندا سەرهەڵدەدا. هەموو ئەمانەش بەڵگەی هەبوونی ئەو پڕۆژە مەعریفییەن.





ئامرازێکی دیکەی گەیاندنی ناوەڕۆکە مەعریفییەکەی گەنجانی کورد: ڕۆژنامەگەری بوو. ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان) لە ژ ٣، ل ٣دا دووپاتی دەکاتەوە:

«هەر میللەتێک مالیکی غەزەتەیەکی خۆی بێ، دەتوانێ بە دەنگێکی بڵند بیگەیەنێتە گوێی ئەو کەسانە کە گوێگر و خادمی مەعاریف و میللەتن..».

بەهۆی بزاڤی ڕۆژنامەگەرییەوە، ئەم نووسەرە گەنجە کوردانە، توانیویانە ئاگاداری چالاکییەکانی یەکتر بن: هەر بەشێکی کوردستان لەگەڵ بەشەکەی دیکەی، یەکانگیر بوونەتەوە و کەوتوونەتە ژێر کاریگەرێتیی یەکتر و بە هەموویان یەک ئەدەبیاتی نەتەوەیی یەکانگیریان دروست کردووە.

پێش ئەوەی کورد لە ساڵی ١٨٩٨دا ڕۆژنامە بە زمانی خۆی بڵاوبکاتەوە، میللەتانی دیکەی وەکو ئەرمەن و عەرەب و فارس و تورک لە ماوەی چارەگی چوارەمی سەدەی ڕابردوودا چەندین ڕۆژنامەیان بە زمانی خۆیان بڵاوکردبۆوە. یەکەم ڕۆژنامەی تورکی بە ناوی تەقویمی وەقایع لە ساڵی ١٨٣٢دا، یەکەم ڕۆژنامەی فارسی لە ئێران لە ساڵی ١٨٥١دا، یەکەم ڕۆژنامەی عەرەبیش لە عێراقدا (الزوراء)، لە ساڵی ١٨٩٦دا، هەر سێکیان سێ ڕۆژنامەی ڕەسمی و دائیرەیی بوون و سەر بە دەوڵەت بوون. بەڵام یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی، بە پێچەوانەی ئەوان، ڕۆژنامەیەکی ئەهلی و تاکەکەسی و ڕۆشنبیرانە بووە، ناواخنێکی ئەدەبیی و ڕۆشنبیریی ئازادی هەبووە.

بەم شێوەیە، ڕۆژنامەگەریی کوردی، بە پێچەوانەی دۆخی



میللەتانی دراوسێی عەرەب و تورک و فارس، لای کورد، لە ئەنجامی (هوشیارییەکی تاکە کەسیەوە) لە دایک بوو: نەک لە ئەنجامی پێداویستی دەوڵەت یان دەزگایەکی حکوومی بۆ بڵاوکردنەوەی پڕۆپاگەندە و هەواڵەکان و بە ئەرشیف کردنی دەنگو باسەکانی ئیدارەی ئەو حکومەتانە. لەو ساڵانەدا ئەو گەنجە کوردانە، زۆربەیان لە حیسابی خۆیانەوە، دەیان ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردییان بڵاودەکردەوە.

دیارترین ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی گەنجە کوردەکان ئەمانە بوون:

- لە ١٨٩٧-١٨٩٩ دوو ڕووناکبیری کورد، د.عەبدوڵڵا جەودەت و ئیسحاق سکووتی، کە دامەزرێنی ڕێکخراوی (ئیتیحاد و تەرەقی) بوون و لە زیندان و لەدەست زەبروزەنگی سوڵتان عەبدولحەمیددا رایانکردبوو، خۆیان گەیاندبووە ژنێڤ: لەوێ دوو ڕۆژنامەیان بە زمانی عوسمانی دەردەکرد؛ یەکەم: ڕۆژنامەی عوسمانلی (١٨٩٧-١٩٠٤) بە زمانی عوسمانی، لەگەڵ ڕۆژنامەیەکی دیکە بە فەرەنسی Osmanli (١٨٩٧-١٨٩٩) کە پاشکۆی (عوسمانلی) بوو.
- ڕۆژنامەی اجتهاد (١٩٠٤). د.عەبدوڵڵا جەودەت .
- کوردستان ( ڕ. قاهیرە /٢٢/ ١٨٩٨/٤ ـ ١٩٠٢).
- کورد ( ڕ. ئەستەمبۆڵ /١٩٠٨).
- ڕۆژی کورد ( گ. ئەستەمبۆڵ /١٩١٣).
- هەتاوی کورد ( گ. ئەستەمبۆڵ /١٩١٤).

- ڕۆژنامەی کوردستان، خولی سێیەم ،لەلایەن سورەییا بەدرخان لە قاهیرە (١٩١٧- ١٩١٨).
- ژین ( گ. ئەستەمبۆڵ /١٩١٨ ـ ١٩١٩).
- کوردستان ( گ. ئەستەمبۆڵ / ١٩١٩ـ ١٩٢٠).
- تێگەیشتنی راستی ( ر. بەغدا ١٩١٨).
- پێشکەوتن ( ر. سلێمانی /١٩٢٠ ـ ١٩٢٢).
- بانگی کوردستان ( ر. سلێمانی ١٩٢٢ و ١٩٢٦).
- رۆژی کوردستان ( ر. سلێمانی ١٩٢٢ـ ١٩٢٣).
- بانگی حەق ( ر. سلێمانی ١٩٢٣).
- ئومێدی ئیستیقلال ( ر. سلێمانی ١٩٢٣).
- دیاری کوردستان (گ، بەغدا ١٩٢٥).
- ژیانەوە ( ر. سلێمانی /١٩٢٤ ـ ١٩٢٦).
- ژیان ( ر. سلێمانی، ژ ١: ٢١/١/ ١٩٢٦ـ ژ ٥٥٣: ١٠/٣/ ١٩٣٨).
- ژین، کە بەردەوامبوونی ژیان بووە، ژ ٥٥٤: ٢٦/١٢/١٩٣٩ تا ژ ١٧١٤: ٧/٢/١٩٦٣
- زاری کرمانجی (گ. رواندز ١٩٢٦).
- ریا تازە ( ر. یەریڤان ١٩٣٠ـ ١٩٣٨ و ١٩٥٥ ـ ١٩٩٣.
- هاوار (گ. ژ ١: ١٩٣٢- ١٩٣٥؛ ژ ٢٧: ١٩٤١- ١٩٤٣) پەنجا و حەوت ژمارە لە دیمەشق.
- یادگاری لاوان (١٩٣٣) و دیاریی لاوان (١٩٣٤) لە بەغدا.








بایەخێکی گرنگی بزاڤی رۆژنامەنووسی کوردی، لە تازەکردنەوەی ئەدەبیدا دەردەکەوێ، ئەمەش لە ئاستی بەرەوپێشەوەچوونی هەموو ژانرەکاندا. چونکە رۆژنامە منداڵدانی ژانرە ئەدەبییە تازەکان و جێگەی پەرەسەندنیانە، بۆیەش دەبینین هەندێ لە یەکەم رۆژنامەنووسەکان (حسێن حوزنی موکریانی، پیرەمێرد، جەمیل سائیب، جەلادەت بەدرخان..) بوونەتە یەکەم تازەکەرەوەکانی ئەدەب.
ئەم رۆژنامە و گۆڤارانە تەنیا بیرورای نەتەوەییان تێدا دەرنەدەبڕا، بەلکو پشتیان بەستبوو بە سیستەمێکی ئێستاتیکی و نووسینی تازە؛ چەند فۆرم و ژانر و تەکنیک و شێوازێکی تازەیان هێنایە ئارا بۆ دەربڕین.

ئەم گۆڤار و ڕۆژنامانە دێن بۆ یەکەم جار نووسەرانی گەنج و ڕووناکبیرانی نوێخواز بە گەل دەناسێنن. لەڕێگەی ئەم گۆڤار و ڕۆژنامانەوە بوو کە بۆ یەکەمین جار نووسەرانی گەنج و شاعیرانی نوێخواز دەردەکەون و باوەڕ بە هێزی نوێخوازانەی خۆیان پەیدا دەکەن و دەتوانن ببن بە هێزێک و مەترسییەک بۆ سەر دەولەت؛ پەیتا پەیتا بەرهەمەکانیان بلاودەکەونەوە و نوێگەرێتی دەکەنە دروشمێک و کارێکی وادەکەن کە جەماوەر بە بیری نوێ و شیعری نوێ ڕابێت و سیستەمی کلاسیکی بیر بچێتەوە. ژمارەی سەرجەم شیعرەکان لەناو گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا لە ماوەی ١٩٢٠- ١٩٣٢ دەگاتە (٢٧٥) شیعر.



زێوەر ١٨٧٥ ـ ١٩٤٨ یەکەم شیعری خۆی لە ١٩١٣ لە گۆڤاری ڕۆژی کورد بلاوکردۆتەوە. حاجی قادری کۆیی لە (١٨٩٨) لەسەر لاپەڕەکانی (کوردستان) لە قاهیرە دەناسرێ. بە هەمان شێوە پیرەمێرد بۆ یەکەمین جار یەکەمین شیعری خۆی لە ئەستەمبۆڵ بلاوکردۆتەوە، ئەمەش لەسەر لاپەڕەی گۆڤاری کورد لە ١٩٠٨. جگە لە دەیان شاعیری تازە دەرکەوتووی دیکە کە هەموویان لە ئەستەمبوڵەوە سەردەردەکەن و شۆرەت پەیدا دەکەن:: عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، کامەران بەدرخان، محمد میهری، سیاپۆش، ئەمین عالی بەدرخان ، نەجدەت کەرکووکلی، داوەر ئەردەلانی، مستەفا شەوقی.
هەر ئەم ڕۆژنامە و گۆڤارانە بوون کە بۆ یەکەمین جار ڕۆشنبیرییەکی فراوانیش لەبارەی شیعر و چیرۆک بلاودەکەنەوە و ژانری (ڕەخنەی ئەدەبی) پەرە پێ دەدەن و بنەمە سەرەتاییەکانی (ئێستاتیکا) دادەمەزرێنن. زۆر لە زاراوە زانستی و فەرهەنگییە تازەکان (بەتایبەتی وشە ئەورووپاییەکان) لەڕێی ڕۆژنامەنووسییەوە لەدایکبوون. لە ئاستی دەوڵەمەندکردنی موفرەداتی زمان و پاککردنەوەی زمانی کوردیش لە وشەی بێگانە هەوڵی باش و کاریگەر درا.
جگە لەمانەش، زۆربەی ئەم ڕۆژنامە و گۆڤارانە بابەتی تەرجەمەکراویان تێدایە و بایەخێکی باشیان دەدایە وەرگێڕان بۆ سەر زمانی کوردی. ئەم وەرگێڕانەش دەبووە هۆی دەوڵەمەندکردنی زمان و ئەدەبی کوردی و تارەبوونەوەی کەشوهەوای کولتوورێکی هاوچەرخ. ڕاستییەکەیشی، هەر لە

سالّی ١٩١٣، واتە لە گۆڤاری (ڕۆژی کورد) بەملاوە بابەخ بە
گەشە پێسەندنی وەرگێڕان دراوە:

بێگانە بە تەرجومەی زوبانی
ئەسراری کتێبی خەڵقی زانی

خاسیەتێکی دیاری ئەو ڕێنسانس و ڕۆژنامەگەرییەی کە گەنجە کوردەکان بەرپایان کرد، ئەو خاسیەتەی لە هەموو ڕێنسانسێکدا هەیە: جیاوازیی دیدی سیاسی و فرەیی بیر بو جۆراوجۆرێتیی بۆچوونەکان بوو. دەبینین، بۆ نموونە بیری پان ئیسلامی، عوسمانیخواز، ریفۆرمیزم، فیدڕالیزم، لەپاڵ بیری ناسیوونالیزم.. رووبەرێکی فراوانیان لەسەر لاپەڕەی رۆژنامە و گۆڤارەکاندا داگیر کردبوو.

جێی ئاماژە بۆ کردنە، ئەم هەموو کار و کردەوە و پڕۆژە و بەرهەمە بێ هاوتا و دەگمەنانە لەو سەردەمەی گەنجە کوردەکاندا، لەخۆوە و بێ بەرنامە نەهاتوونەتە دی، بەری داری هیچ ڕێککەوتێک نین: بەڵکو لە بێدارییەکی قووڵ و لە هوشیارییەکی بەرنامەڕێژەوە هاتوونەتە بەرهەم. بەڵگەشمان ئەوەیە کە بەدەگمەن نووسەرێک دەبینین ڕاستەوخۆ باسی لەم پڕۆژەیە نەکردبێت و لەو ململانێیە نەدووابێت کە لەنێوان دنیای کۆن و دنیای نوێدا هەبووە. حسێن حوزنی موکریانی لە (گ. زاری کرمانجی، (٢٣)، سالّی ١٩٣٠) دەڵێ:

«ئەو سەردەمەی ئێمە تێیدا دەژین سەردەمی سەرکەوتن و بەرزبوونی عیلم و فەنە، سەردەمی تەئلیف و کتێب و نەشری مەعاریف و چاپەمەنییە..».



گرووپی نووسەرانی گۆڤاری ژین (١٩١٨ ـ ١٩١٩)، بە هەمان شێوە؛ پشتیان بەستبوو بە فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیەتێکی هاوچارخ و سیستەمێکی تازەی بیرکردنەوە و نووسین. دروشمیان لەم دێڕەدا وەدیار دەکەوێ کە لە وتاری " بیر حەسبحال " بە تورکی لە ژمارە (١)دا لە ٧ /١١ ١٩١٨ دا نووسیویانە :

" ئایدیۆلۆژیەتە کۆمەڵایەتی و سیاسیە کۆنەکان، ئەمڕۆ، روو لە هەرەسن. ئێمە ئەمڕۆ بەشداری لە سازکردنی چەند ڕچە و پرینسیپێکی تازە دەکەین".

حاجی، بە هەمان شێوە، گەنجەکان ئامۆژگاری دەکات:

دەستگیریت لە عەمەلدا قەت نەکا مورشیدی پیر
دەستی تۆی گرتووە، پێی بەستووی مانەندی ئەسیر

ئەحمەد موختار بەگی جافیش بەڵێن دەدا:

ئەمڕۆ با وابێ بەڵام ڕۆژێ ئەبێ ئەولادی کورد
دێنەوە مەیدان بە عیلم و سەنعەت و عیرفانەوە

شێخ نووری شێخ ساڵحیش موژدە و ئومێد دەبەخشێتەوە:

سبحەینێ ئەم تەجەددودە بۆ تۆیە ئەی شەباب
بۆ تۆیە ئەی ئومێدی وەتەن، خادیمی حەیات
ئەی ئافتابی فەجری تەمەن، مایەی نەجات!
ئەی فەجری بێ غوبار و کەدەر؛ عالەمی ئەمەل
چاوی لە تۆیە، تۆ کە ئومێدی هەموو کەسی !
ئەلحەق عیلاجی دەردی، دەوایەکی نەورەسی!

ئەم ڕووناکبیرە گەنج و نوێخوازانە باوەڕێکی ئەوتۆ بە وزە و توانای نۆژەنگەرای خۆیان پەیدا دەکەن کە دەتوانن ببن بە هێزێک و مەترسییەک بۆ سەر دەسەڵاتی عوسمانی و مورشیدە پیرەکانی مەیدانی فەرهەنگ.

کەواتە، ئەمە، مەلا و شێخ و ئوستاد و میرەکان نەبوون کە ئەم ڕاپەڕینە کولتوورییەی سەرەتای سەدەی بیستەمیان دروستکرد: نەسلێکی نوێی قوتابی و گەنج و خوێندکاران بوون کە توانییان بۆ یەکەم جار لە مێژووی کوردستاندا دەرگا و سنوورەکانی شارۆچکەکانی خۆیان بشکێنن و خۆیان بگەیەننە ئەستەمبۆڵ و ژنێف و قاهیرە و پاریس، لەوێوە بتوانن هەندێکیان بخوێنن و ئەوانی دیکەش هیچ نەبێ زمانە ئەورووپییەکان فێر ببن بۆئەوەی بتوانن ئەو ڕێنسانسە لە کوردستاندا بەرپا بکەن و بنەماکانی پرۆژەیەکی ئەپستمۆلۆژی لەناو کورداندا گەڵاڵە بکەن.

بەم شێوەیە، ئەم دوورەوڵاتییە خواستەمەندانەیەی (گەنجە کوردەکان) بەتایبەتی لە ئەستەمبۆڵدا و تەنانەت پاشانیش کاتێ لە ١٩٢٣ بەملاوە پرژوبڵاودەبنەوە، بە یەکەمین هەنگاو لە قەڵەم دەدرێت لە مێژووی دوورەوڵاتیی کورددا، کە وەک دەستاوەردێک بەشێوەیەکی نەخشە بۆ کێشراو بەکاری بهێنن بۆ دروستکردنی دیالۆگێکی شارستانییانە لەگەڵ کولتووری ڕۆژئاوادا: لەپێناو تازە کردنەوەی ڕووناکبیری و بوژاندنەوەی



ژیانی کولتوری و سیاسیی کورد؛ لەپێناو وەدیهێنانی ئەو پرۆژە مەعریفییەی کە بەناو داهاتووی کورددا - تا ڕۆژی ئەمڕۆ ڕەگاژۆ بوو..

د. عبداللە جەودەت ڕۆڵێکی مەزنی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی بیری یاخیگەرانە و گەنجانە و ئازادیخوازانەی کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم، توانیی ببێتە بناغەیەک و سەرکردەیەکی ئەو شۆڕشە ڕووناکبیرییە گەنجانەیەی کە ناسراوە بە بزاڤی (گەنجە تورکەکان) و (گەنجە کوردەکان). ئەوەتا لە نامەشیعرێکیدا لە ٢ اغسطوس ١٨٩٨، لە شاری ژنێفەوە -لە سویسرا- بۆ عبدالرحمن بەدرخانی سەرنووسەری یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی (کوردستان)ی نووسیوە دەڵێ:

ایام ما گذشت بغربت ولی چه غم
اشراق شرق شد اثر اغتراب ما

واتە:

ڕۆژەکانمان لە ئاوارەییدا بە هەدەر چوون، بەڵام چ باک:
ڕۆژهەڵاتی سەرتاپا درەوشاندەوە ئاوارەییمان





«گەنجە کوردەکان» کە لەم دێڕانەی سەرەوەدا بەخێرایی ناوی هەندێکم بردوون، هەر یەکێک لە ئەوان و چالاکییەکانیان و ڕێڕەوی بیرکردنەوەیان، پێویستی بە کتێبێکی سەربەخۆ هەیە. ئاواتەخوازم ئەکادیمیا و ئینسکلۆپیدیا و زانکۆکانمان کاری شایستەی بە خۆیانی لەسەر بکەن.

گەنجە کوردەکان، جگە لە حاجی قادری کۆیی و د. عبدالله جەودەت و عبدالرحمن بەدرخان و میقداد-مەدحەت بەدرخان و کامەران بەدرخان و جەلادەت بەدرخان و سورەییا بەدرخان و ئەمین زەکی بەگ (١٨٨٠- ١٩٤٨) کە ناویان لە سەرەوەدا زۆر هاتووە، ئەم نووسەرە و ڕووناکبیرانەش ڕۆڵی کاریگەریان هەبووە بەسەر دامەزراندنی پڕۆژە مەعریفییەکە:

- لوتفی فیکری دیاربەکری، کوڕی حوسێن پاشای دێرسیمییە. خوێندنی مافی لە پاریس تەواوکردووە و لە ١٩٠٨ گەڕاوەتەوە ئەستەمبوڵ. نووسەرێکی باش بووە و ئەندامی گەلێک لە ڕێکخراوەکان بووە، داوای دەوڵەتی عیلمانیی کردووە و داوای کردووە دین لە دەوڵەت جودا بێتەوە.

- مەعرووف جیاوک (١٨٨٥- ١٩٥٨) نووسەرێکی بەتوانا، ژیانێکی پڕ لە چالاکیی سیاسیی هەبووە، دامەزرێنی (یانەی سەرکەوتن) لە ١٩٣٠.

- خەلیل خەیالی (١٨٧٦- ١٩٢٦) مۆدانی بووە و لە ١٩٠٠ چۆتە ئەستەمبوڵ، کتێبی (ئەلفبای کرمانجی)ی نووسیوە، ئەندامی (هێڤی) و (تەعاون و تەرەقی) بوو.

- عبدالکریم سلێمانیەلی (١٨٨٠- ١٩٢٩) یاساناس،

نووسەر، تورکی و فارسی و عەرەبی و فەرەنسیشی زانیوە، لە ١٩٠٨ چۆتە ئەستەمبۆڵ و لەوێ کۆلێژی قانوونی تەواوکردووە.

– ڕەفیق حیلمی (١٨٩٨– ١٩٦٠) قوتابخانەی ئەندازەی باڵای لە ئەستەمبۆڵ تەواوکردووە.

– زێوەر (١٨٧٥– ١٩٤٨) شاعیر و نوسەر، لە ١٣١٧ی ڕۆمی چۆتە ئەستەمبۆڵ و پەیوەندیی بە ڕێکخراوی (هێڤی) کردووە.

– ئیسماعیل حەقی بابان (١٨٧٦– ١٩١٤) ئەرکانی گەورەی ئیتیحاد و تەرەقی بوو، پاش ١٩٠٨ پۆستی وەزارەتی مەعاریفی پێ سپێردراوە. گەلێک کتێبی بە عوسمانی چاپکردووە.

– مەحموود جەودەت بەگ (١٨٨٩– ١٩٣٧) فەرەنسی و ئینگلیزی و فارسی و تورکیی زانیوە. لە ١٩١١ قوتابخانەی جەنگی شاهانەی لە ئەستەمبۆڵ تەواوکردووە و لە ١٩١٩ هاتۆتەوە سلێمانی. لە لەشکر کاری دەکرد، بەڵام نووسەرێکی بەتوانا بوو.

– نەجمەدین حوسێن کەرکووکی (١٨٨٦– ؟) برای ئەسیریی شاعیر، نووسەر، ئەندامی (کورد میللەت فیرقەسی) بووە و لە زۆر ڕێکخراوی تریش کاری کردووە. لە دوای ١٩٢٢ لەدەست ستەمی ئەتاتورک هەڵات و چووە بولگاریا.

سالح قەفتان (١٨٨٤– ١٩٦٨) مەکتەبی حەربیەی لە ئەستەمبۆڵ تەواوکردووە، لە جەمعیەتی زانستی کاری کردووە.

– مەسعوود سلێمانیەیی (١٨٨٩– ١٩٧٩) نووسەر،



دکتۆرایەک بە زمانی فەرەنسی لە ١٩٣٣ لەبارەی باری کۆمەڵایەتیی کورد دەنووسێ.

هەروەها عەلی عیرفان (؟– ١٩٦٨)، جەمیل صائب (١٨٨٧– ١٩٥١)، محمد صالح بەدرخان (١٨٧٤– ١٩١٥)، پیرەمێرد (١٨٦٧– ١٩٥٠)، ئەحمەد موختاربەگی جاف (١٨٩٨– ١٩٣٥)، عەلی کەمال باپیرئاغا (١٨٨٦– ١٩٧٤)، عبدالله عەزیز (عەبە هەولێری ١٩٠٢– ١٩٦٣)، مستەفا صائب (١٩٠٤– ١٩٨٠)، ڕەشید نەجیب (١٩٠٦– ١٩٦٨)، بێکەس (١٩٠٥– ١٩٤٨)، شێخ نووری شێخ سالح (١٨٩٦– ١٩٥٨)، خەلەف شەوقی داودی (١٨٩٨– ١٩٣٩)، ئەحمەد ئاغای کەرکووکلی زادە (١٨٨١– ١٩٧١)، عبدالخالق ئەسیری (١٨٩٥– ١٩٥٨)، بەختیار زێوەر (١٩٠٨– ١٩٥٢)، ئیحسان نووری پاشا (١٨٩٢– ١٩٧٦)، عبدالواحد نووری (١٩٠٣– ١٩٤٤)، ئیبراهیم ئەحمەد (١٩١٤– ٢٠٠٠)، حامید فەرەج (١٩١١– ١٩٩٥)، شاکیر فەتاح (١٩١٤– ١٩٨٤)، عبدالله گۆران (١٩٠٤– ١٩٦٢)، محمد عەلی کوردی (١٩٠٥– ١٩٥٧)، هەروەها کەریم سەعید زانستی، مەمدووح سەلیم بەگ، ئەحمەد ڕامز کوردیزادە، بەدری مەلاتیەلی، ئەمین فەیزی بەگ، سەباح شەوقی، بدیع الزمان مەلا سەعید کوردی، ڕەفعەتی مەولانزادە، ئەحمەد خواجە، ڕەشید زەکی کابان، قەدری جەمیل پاشا (زنار سلۆپی)، ئەکرەم جەمیل پاشا، هەمزە موکسی، فوئادی تەمۆ و دەیانی تر..

# دیماهی

بزاڤی «گەنجە کوردەکان» لە هەندێ ڕووەوە شۆڕشی خوێندکارانی فەرەنسام لە ساڵی ١٩٦٨ بیردەهێنێتەوە، بەڵام بێگومان جیاوازیگەلێکی زۆریش لەنێوانیاندا هەیە.

زۆربەی هەرە زۆری ڕووناکبیر و کادیر و نووسەرانی پڕۆژەی «گەنجە کوردەکان» ئەو خوێندکارانە بوون کە لە قاهیرە و لە پایتەختەکانی ئەورووپا، بەتایبەتیش -زۆربەی هەرە زۆریان- لە زانکۆکانی ئەستەمبۆڵ دەیانخوێند، هەندێکیشیان لە مەکتەب و قوتابخانە باڵاکاندا قوتابخانەکانیان بۆ وەدیهێنانی هەمان ئامانجی ئەپستمۆلۆژی بەکارهێنابوو.



ئنجا سەرەڕای خاسیەتی خوێندکاربوونی ئەو کادیرانە و سەرەڕای ئەوەی چەند توخمێکی خوێندکارانەی پیشەیی و ڕێکخراوەییانەش وەک (ڕێکخراوی تەڵەبەی هێوی) لە ئەستەمبۆڵ ١٩١٣ و (کۆمەڵەی لاوان) لە هەولێر (١٩٢١) و (کۆمەڵی لاوان) لە بەغدا (١٩٢٣) لەناویاندا هەبوون.. کەچی دەبینین بەهیچ شێوەیەک فەلسەفەی ئەم پڕۆژە مەعریفییەی گەنجانی کورد نابێتە هەمان فەلسەفەی ئەو خوێندکارانەی کە لە ١٩٦٨ لە فەرەنسا لەپێناو چاکسازییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی ڕاپەڕینیان بەرپاکردبوو.

هەر چۆنێک بێ، جیاوازی و لێکچوونەکانی ئەم دوو ڕاپەڕینەی کورد و فەرەنسا: گەنجە کوردەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم لە کوردستان لەگەڵ ڕاپەڕینی خوێندکارانی فەرەنسای ١٩٦٨ بابەتێکی بەراوردکاریی هێند بەپێزە کە شایستەی ئەوەیە تۆژینەوەیەکی بەراوردکارانەی بەبڕشت و سەرکەوتووی لێ دەربچێت.

بزاڤی گەنجە کوردەکان لە کوردستاندا بزاڤێکی کولتووری و نەتەوەیی بوو، بەڵام چەند توخمێکی خوێندکاریی بەهێز و چەند ڕیشەیەکی مەعریفیی خوێندکارانەش لەناو ئەو بزاڤەدا ڕۆڵی کاریگەرییان دەبینی بەسەر پێشکەوتنە کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و کولتوورییەکەی کە دواتر بەسەر کوردستاندا دێت. بۆیە پێویستە خەت بە ژێر ئەو قسەیەدا بێنین و بڵێین: یەکەمین پڕۆژەی مەعریفیی کورد بە بەشداربوونێکی زۆر ئەکتیڤی قوتابیان و لاوانی کوردستان ئەنجام دراوە.

خاسیەتەکانی پڕۆژە مەعریفییەکەی «گەنجە کوردەکان» لەچاو ژیانە کولتوورییە ئاسایی و باوەکەی پێش خۆیان لەم خاڵانەدا دەردەکەوێ:

بەپێچەوانەی مەلا و شێخ و پیر و نووسەر و شاعیرانی کلاسیک کە لە کولتووری ئیسلامییەوە لەدایک ببوون؛ گەنجە کوردەکان لە چەند کەناڵێکی تەواو تازە و جیاوازەوە، لە سەرچاوەگەلێکی ڕۆژئاواییەوە ئاویان خواردبۆوە: ڕەگوڕیشەکانی خۆیان لە کولتووری ئەورووپاییەوە وەرگرتبوو.

گەنجە کوردەکان، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کوردستاندا، یەکەمین چاپخانە و یەکەمین ڕۆژنامە و یەکەمین گۆڤار و یەکەمین قوتابخانە و یەکەمین ڕێکخراوە پیشەییەکان و یەکەمین بنکە ڕۆشنبیرییەکانیان لە کوردستاندا دامەزراند.

یەکێک لەو پڕۆژانەی جێبەجێیانکرد، بریتی بوو لە نووسینەوەی مێژووی نەتەوەیی خۆیان و شیتەڵکردنەوەی دیرۆکی نیشتیمانییان؛ واتە دروستکردنی ناسنامەیەکی نیشتیمانی و کولتووریی نەتەوەیی ئەوتۆ کە تا ئەوکاتە بێ هاوتا بوو. بەرهەمەکانی حسێن حوزنی موکریانی و ئەمین زەکی بەگ و تۆفیق وەهبی لەم بەستێنەدا، وەک دەزانین، هەرگیز پێشتر هیچ پێشینەیەکی هاوشێوەی نەبووە لە دەفری زمانی کوردیدا.



بەپێچەوانەی مەلا و شێخ و پیر و شاعیرانی سەدەکانی ڕابردوو کە ئەزموونەکانی ژیانیان لە چوارچێوەی کوردستان تێپەڕی نەدەکرد؛ گەنجە کوردەکان توانیان پانتاییەکی زۆر فراوانتری ژیان و ئەزموون تاقی بکەنەوە: تاقیکردنەوەکانیان لە ئەستەمبۆڵ و قاهیرە و پایتەختەکانی ئەورووپاوە هەڵێنجابوو، سوودیان لە ژیان و ئەزموونەکانی ڕۆژئاوا، لە زانست و هونەر و ئەدەبیات و زانکۆکانی ئەورووپا وەرگرتبوو.

گەنجە کوردەکان، بەپێچەوانەی نووسەر و ڕووناکبیرانی کلاسیک و پێش خۆیان، بەشێوەیەکی ڕێکخراوەیی و پێکەوەیی و نەخشە بۆکێشراو، دەستیان کردە کار لەپێناو وەدیهێنانی پڕۆژە مەعریفییەکەیان.

گەنجە کوردەکان، بەپێچەوانەی ئەوانی سەدەکانی ڕابردوو، خەباتی ڕزگاریخوازیی نەتەوەیی و چەکدارییان تەرجەمە کردە سەر وشە و ئایدیۆلۆژیا و خەباتی کولتووری.
دیسان بەپێچەوانەی کلاسیک، ڕەخنە و یاخیبوونەکانی خۆیان، چەند ڕووەو داگیرکەر بوو.. ئەوەندە و زیاتریش ڕووەو دەسەڵاتی کۆنەخوازی ناوخۆ بوو. بۆیە لە سەردەمی ئەواندا، واتە لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەملاوە، ژیانی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و کشتوکاڵی، بەشێوەیەکی گشتیش ژیانی شارستانی - بەتایبەتی لە کوردستانی عیراقدا - گەشەسەندنێکی بەرچاو بەخۆیەوە دەبینێ.

گەنجە کوردەکان چەند ئامرازێکی تازە و چەند دەستاوەردێکی نوێیان بەکارهێنا بۆ دەربڕینی بۆچوون و بۆ ئەنجامدانی چالاکییەکانیان: چاپخانە، ڕێکخراوە پیشەییەکان، ڕۆژنامە و گۆڤار. هەروەها بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئەدەبیاتی کورددا چەندین ژانری تازەی ئەدەبی و چەندین فۆرم و تەکنیکی تازەی دەربڕینیان هێنایە ناو ئەدەبی کوردییەوە. ئەمە جگە لە بەکارهێنانی (نەخشەی جوگرافی) و فۆتۆگراف و تابلۆی هەڵکۆڵدراو (گراڤوور) و ئامێری فۆتۆگراف.. کە هەموو ئەمانە سەرکەوتنی پرۆژەکەیانی مسۆگەرتر کرد.

پرۆژە مەعریفییەکەی گەنجە کوردەکان چەند چەمکێکی ڕۆژئاوایی و تازەیشی لەگەڵ خۆیدا هێنایە ناو کولتووری کوردەوە: دیموکراسی، ئازادیی تاکەکەس، مافەکانی ئافرەت، دەستوور، مەدەنیەت، ئازادیی ڕادەربڕین و ڕۆژنامەنووسی. تەنانەت هەر لە ناوەڕاستی ساڵانی بیستەکانەوە چەمکی «جیاوازیی چینایەتی» و فەلسەفەی مارکسیزم، لەڕێگەی چەند نووسەرێکی وەک عبدالواحید نووری و سالار قەرەداغی و قانیعی شاعیر بەناو کورداندا بڵاوبوونەوە. ئەمەتا نووسەرێکی گەنج کە تەمەنی لە (٣٣) ساڵێک تێپەڕی نەکردووە، ئەحمەد عەزیز ئاغا لە لاپەڕە دووی ژمارە (٨)ی ڕۆژنامەی (ژیان) لە (١١)ی مارتی١٩٢٦، لە وتارێکدا بە ناونیشانی (طەبەقەی خەواص و طەبەقەی عەوام) بەفراوانی باسی ئەوە دەکا کە چینی «خەواص» دەتوانێ ڕۆڵی بزوێن لە کۆمەڵدا ببینێت و بەرەو پێشکەوتنی ببات و دەڵێ: «ئەم دوو طەبەقەیە.. هەر دوو لا بە



چاوێکی بێگانەیی و نەفرەتەوە تەماشای یەکتریان کردووە».

هەر لەسەر دەستی ئەم گەنجە کوردانەش بوو کە ئێستاتیکا و هونەرە جوانەکان، بەتایبەتی شانۆ و شێوەکاری و مۆسیقا.. بە واتا مۆدێرن و پێشکەوتووەکەی خۆی، بووژانەوە و گەشەیان سەند.

گەنجە کوردەکان توانیان بۆ یەکەم جار لە مێژوودا، بە هەوڵی هەموویان و لەڕێگەی ڕێکخراوەکانیانەوە خۆیان بگەیەننە نێوەندە نێودەوڵەتییەکان؛ لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس بەشێوەیەکی ئۆفیسیاڵ داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ کوردستان بکەن.



**یەکێک لە قوتابخانەکانی سەردەمی گەنجە کوردەکان لە سلێمانی**



ژێدەر و سەرچاوە:

«١»

Metin AND: A history of theatre and poputa, Paris: 1968, P. 349.

«٢».

Bernard LEWIS: Islam et laicite, tr. de l anglais par P. DELAMAR, Ed. Fayard, Paris: 1987, PP. 139.

«٣» عبداللە بابەکر حەمەد ئاغا: رۆژنامە و رێکخراوە کوردییەکانی تورکیا، لە تورکییەوە ئامادەی کردووە، کاروان، ژمارە ٦٤، س ١٩٨٨، ل ٨٨ ـ ٩٢.

«٤» لاهووتی: کوردستان و کورد، و: جەبار قادر، گ. هەزار مێرد، ژ(٣)، سلێمانی: ١٩٩٨، ل ١٦٢.

«٥»

Alessio BOBACI: Histoire de la litterature turque, Paris: 1968, P. 4.

«٦»

( traduit en français et cité H. BOZARSLAN: Le problème national kurde en Turquie Kemaliste, Mémoire de diplôme de l' E.H.E.S.S., sous la direction de M. ROBERT, Paris: 1986, P.138-140

«٧» د. عزالدین: ئەدەبیاتی نوێی کوردی، بەغدا: ١٩٨٩

هەروەها :
- ئومێد ئاشنا: پیرەمێردی رۆژنامەنووس، سلێمانی: ١٩٩٨
- تاهیر ئەحمەد حەوێزی: شانۆگەری لە کوردستاندا، رامان ژمارە ٢٧، ساڵی ١٩٩٩
- گۆڤاری هەتاو، ژمارە ١٧٢و ٢٩ی شوباتی ١٩٦٠، لاپەڕە ١٩ ـ ٢٠.
- محەمەد تەیموور: شانۆ لە قوتابخانەکاندا، گ. ئوتۆنۆمی، ژ ٢٠ و ٢١، ١٩٨٤، ل ١٠٥ ـ ١١٢و ٧٦-٨٠.
- سەباحی غالیب: دوو تەقەڵای بێ سوود، چاپخانەی هەڵوێست، لەندەن: ١٩٨٤.

- رەفیق حیلمی: شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، ب٢، بەغدا: ١٩٥٦، ل ٢٠٤، ٢٠٥، ٢٠٦.
- عبدالرزاق بیمار: دانیشتنێک لەگەڵ گۆران، گ، بەیان، ژمارە ٢، بەغدا: شوباتی ١٩٧٠، ل٣
- د. محمد عبدالله کاکەسوور: گەشەکردنی خوێندنی فەرمی لە لیواکانی کوردستانی عیراقدا، بڵاوکراوەی ئاسۆی پەروەردەیی، هەولێر: ٢٠٠٤.

Jean DENY: " Littérature turque ", in Grand Mémonto, Encyclopédie Larouse, Paris.

Ahmed HACHIM: " Les tendances actuelles de la littérature turque ", in Mercure de France,



35me année, N 627,Paris: 1924, P. 641-655،

N.Zaza: ma vie de kurde kurde Ed. p- m. Favre, Lausanne 1982 ler, 2e chap).

Pierre Rondot: publecations kurdes em caracteres latins (Haw-ar R.K) in "Bulletin d, etudes orientales e l.int. fr. de damas. T.2. 1933.pp.3-8

* C. J. EDMONDS: " A kurdish.- per " in Journal of thenewspa Central Asian Society, Vol. 12; Part. 1, 1925, p. 83-90.

Roger Ledcot: Litterature kur-der in "Enccydopedie de la pleiade, hidtorie des littr-ratures, pleiade, historie des littrratures Ed. Galinard , V. 1, paris 1977.pp 795-805

Joyce Blau: Les Kurd et le kur-distan (inst. Fr. Rech. en iran) )paris 1989 p.. (XIV

- رۆژنامەی ژیان، ژمارە ( ١٦٧ )ساڵی ١٩٢٩
- ژیان، ژمـــــــارە ( ٤٦٢ ) ١٤ / ١٢ / ١٨- ١٩٣٥،

هەروەها رۆژی سێ شەممە، ٢ی ئاغستۆسی ١٩٢٧.

- ژیان، ژمارە ( ٤٦٢)، ١٤/١٢/١٩٣٥، ل ٦٩، ژمارە (٦٢)، سلێمانی:١٩٢٧، ل ٣؛ هەروەها ژمارە ١٦٩، دووشەممە ٢٢ی نیسانی ١٩٢٩

- رۆژنامەی ژین، ژمارە ( ٩٥٣)، شوباتی ١٩٤٩، ژمارە ( ٩٦٧)، حوزەیرانی ١٩٤٩،

- ژین، ژمارە ( ٨٩٣)، ١٩٤٧

- ژین، ژمارە (٩٨٣)، ساڵی ١٩٤٩ ، ژمارە ( ٤٦٢)، ١٤/١٢/١٩٣٥



کتێبە چاپکراوەکانی دیکەی نووسەر:

١- ماڵئاوا ئەی وڵاتەکەم. شانۆنامە. بڵاوکراوەی یەکیەتیی نووسەرانی کوردستان - شاخ: ١٩٨٤.

٢- بەیانی باش ئەی غەریبی. شانۆنامە. بنکەی یەکگرتن لە کۆپنهاگن: ١٩٨٨ .

٣- ئیگزیل Exile شیعر. بڵاوکراوەی ئەنستیتووی کورد لە پاریس، پاریس: ١٩٩٢.

٤- ژمارەکانی گۆڤاری کوردستان (ئەستەمبۆڵ: ١٩١٩)، دەزگای گوڵان، هەولێر: ١٩٩٨.

٥- ڕۆژنامەگەریی کوردی بە زمانی فەڕەنسی، سەنتەری برایەتی، هەولێر: ١٩٩٨. (چاپی٢: دەزگای خەندان: ٢٠٠٦).

٦- سەرچاوەکانی کوردناسی، بنکەی گەلاوێژ: ١٩٩٨.

٧- زێڕی ناو زبڵ. تۆژینەوە و تێکستی وەرگێڕدراوی کوردۆلۆژی، دەزگای سەردەم، سلێمانی: ١٩٩٩ .

٨- ئینجیل لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، دهۆک: ١٩٩٩. (چاپی دووەم بە کرمانجیی ژووروو، دهۆک: ١٩٩٩)

٩- وێنەی کورد لە ئەرشیفی کوردناسەکاندا، بنکەی وێران، هەولێر: ١٩٩٩.

١٠- جوایەز، شیعر (بە هاوبەشی شاعیرانی دیکەی هەولێر)، دەزگای ئاراس: ١٩٩٩.

١١- سپیاتییەکانی ناو ڕەش، شیعر. بنکەی وێران، هەولێر: ١٩٩٩.

١٢-دراسات فی تاریخ الکورد. ترجمە: ترزە جاف، رابطە کاوا، بیروت: ١٩٩٩.

١٣- مەلا مەحموودی بایەزیدی، دەزگای ئاراس، هەولێر:٢٠٠٠

١٤- رۆژنامەی کوردستان(١٨٩٨)، بە هاوبەشی، بنکەی گەلاوێژ، سلێمانی:٢٠٠٠

١٥- پەتاتەخۆرەکان، کۆمەڵە چیرۆک، هەولێر:٢٠٠٠. (چاپی2: بنکەی هاڤیبوون، بەرلین: ٢٠٠٢؛ چاپی3: هاموون،

سلێمانی: ٢٠٠٥

١٦- مێژووی شانۆ لە ئەدەبیاتی کوردیدا، دەزگای ئاراس:٢٠٠١ .

١٧- مولازم تەحسین و شتی تریش، نۆڤلێت. بنکەی گەلاوێژ، سلێمانی:٢٠٠١ .

١٨- ژەنەڕاڵ شەریف پاشا، تۆژینەوەی مێژوویی، دەزگای سەردەم: ٢٠٠١ .

١٩- چۆڵستان، وەرگێڕانی کۆمەڵە چیرۆکی پەتاتەخۆرەکان بۆ ڕێنووسی لاتینی - کرمانجیی ژووروو، دەزگای ئاڤێستا، ئەستەمبۆڵ: ٢٠٠١

٢١- جوایەز (چیرۆک و بەرهەمی هاوبەش لەگەڵ شاعیرانی هەولێر)، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠١.

٢٢- عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، تۆژینەوەی ئەدەبی، دەزگای سپیریز، دهۆک: ٢٠٠٢

٢٣- مێژووی وەرگێڕان لە ئەدەبیاتی کوردیدا لە کۆنەوە تا ١٩٣٢، بڵاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی: ٢٠٠٢

٢٤- سانتیاگۆ دی کۆمپۆستێللا، ڕۆمان، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٢. چاپی دووەم: دەزگای ڕۆژهەڵات، سلێمانی: ٢٠٠٥

٢٥- پیاوێکی شەپقەڕەشی پاڵتۆڕەشی پێڵاو شین، ڕۆمان، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٣. چاپی٢: وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی: ٢٠٠٥

٢٦- منداڵباز، ڕۆمان، بڵاوکردنەوەی ماڵی شەرەفخانی بەتلیسی، هەولێر: ٢٠٠٣ (چاپی ٢: یانەی قەڵەم: ٢٠٠٦)

٢٧- حەشیشەکێشەکان، شانۆنامە، بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر: ٢٠٠٣

٢٨- باوک، شانۆنامە، نووسینی ئۆگۆست ستریندبێرگ، و. لە فەرەنسییەوە. دەزگای ئاراس: ٢٠٠٤

٢٩- باخچەیەک شیعری فەرەنسی، لە فەرەنسییەوە، دەزگای سەردەم، سلێمانی: ٢٠٠٤



٣٠- ڕێبازە ئەدەبییەکان، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٤ (چاپی دووەم دەزگای وەرگێڕان، هەولێر: ٢٠٠٦)

٣١- چەند نامەیەکی فەرەنسی، سەنتەری ڕووناکبیریی هەتاو، چاپی یەکەم و دووەم، هەولێر: ٢٠٠٥

٣٢- وێنەی کورد لە ئەرشیفی کوردناسە ئەورووپییەکاندا، وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر: ٢٠٠٥

٣٣- مێژووی شیعری نوێی کوردی ١٨٩٨- ١٩٥٨، تۆژینەوە، دەزگای هانا، هەولێر: ٢٠٠٦

٣٤- ڕەئیس ڕەمەزانەکان، چیرۆک، دەزگای هانا، هەولێر: ٢٠٠٦

٣٥- زمانی حەیزەران، لەبارەی کێشەی گەنج و قوتابیانەوە، تۆژینەوە، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی: ٢٠٠٦

٣٦- بۆ ڕۆدانی کوڕم، شیعر، چاپخانەی پاک، هەولێر: ٢٠٠٦

٣٧- پێنج کتێب و نیو، شیعر، دەزگای ڕۆژهەڵات، سلێمانی: ٢٠٠٦

٣٨- کورد لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە، تێکست و تۆژینەوە، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٦

٣٩- مێژووی هونەری شێوەکاری لە کوردستاندا، لە کۆنەوە تا ١٩٥٨، بڵاوکراوەی گۆڤاری شێوەکاری، دەزگای مێرگ: ٢٠٠٧

٤٠- کرۆنۆلۆژیای کوردستان، دەزگای بەدرخان، هەولێر: ٢٠٠٧

٤١- حەکایەتەکانی باوکم، ڕۆمان، چاپخانەی شڤان و دەزگای بەدرخان، سلێمانی- هەولێر: ٢٠٠٧

٤٢- هەڵبژاردەیەک لە شیعرەکانی ژاک پریڤێر، وەگێڕان لە فەرەنسییەوە. دەزگای سەردەم، سلێمانی: ٢٠٠٧

٤٣- سوڵتانە عوسمانییەکان، تۆژینەوە و ئەلبووم، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی: ٢٠٠٧